# إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ

# نوێژ

## پێگە، فەلسەفە، حوکم، خشوع و گەردن کەچی


نوسینی

حسن علی بۆسکێنی

پێشکه شه : بەهەموو ئەوانەی نوێژ
دەکەن بەڕووناکی چاو، ئارامی دڵ،
وە نوێژ دووریان دەخاتەوە لە تاوان.

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على المبعوث رحمة للعالمين، وعلى آله وصحبه وأتباعه إلى يوم الدين.

لەدینی پیرۆزی ئیسلام دا پەرسشەکان پێگەیەکی گەورەیان هەیە، بەتایبەت نوێژ، چونکە لەقورئاندا زۆر ناوی هاتوە، لەهەموو کاتەکاندا ئەنجام دەدرێ، وە جۆراو جۆریشـــە، وە ئاشـــکراو نەهێنی تێدا ڕەچاو دەکرێ، وە کۆڵەکەی دینە، وە یەکەم شـــتێکە لەگەڵ بەندە حســـابی لەگەڵ بکرێ لە نێوان بەنـدەکان لەحەقی خوا دوای ئیمـان، وە نوێژ کاریگەری ڕاستەو خۆی لە سەر بکەرەکەی، وەچاکترین بابەتیشە لەزاتی خۆیدا، وە هەموو دینەکان لەسەری کۆکن، بۆیە بەپێویستم زانی شتێکی لەســەر بنوســم بەڵام لە ســەر ئەحکامەکان و وردەکاریە ڕواڵەتیەکان نا، بەڵکو لەســـەر پێگەو فەلســـەفەو خشـــوع و حوکمی نەکردنی نوێژو کەمێکیش باسی شـــەو نوێژم کردوە، بەهیوای ئەوەی کەخوێنەرانی ئازیز ســـودی لێوەر بگرن و نزایەکیش بۆ ئێمە بکەن و بابەتەکە دەوڵەمندتر بکەن بەرەخنەو پێشنیار،

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

## بەشی یەکەم

# پێگەو گرنگی نوێژ

بسم الله الرحمن الرحيم

مسـولْمانانی ئازیز "نوێژ" پێگەو گرنگیەکی زۆری هەیە لەشـەریعەتی ئیسـلامدا، ئەگەر بێت و مەرجەکان و ڕوکنەکان و ئاداب و سـونەتەکانی ڕەچاوبکەین، دیارە هە مووومان دەزانین نوێژ گرنگە، بەڵام بیر خسـتنەوە شـتێکی بـاشـــە خوای گەورە دەفەرموێ: { وَذَكِّرْ فَإِنَّ الذِّكْرَىٰ تَنْفَعُ الْمُؤْمِنِينَ}

بۆیە ئەمە هەوڵێکە بۆ زیاتر ناسین و تێگەیشتن لەنوێژ.

١. "نوێژ" فەرمانی خوایە لەدەیان ئایەتدا فەرمانی پێکراوە و ئیماندارانی پێ وەسف کراوە: {وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ}

(البقرة: ٤٣). واتە: نوێژ بکەن و زەکات بدەن و لەگەڵ کڕنۆشبەران کڕنۆش ببەن.

٢. مەدحی ئیمانداران کراوە بە نوێژکردن : { قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ} (المؤمنون: ١) {ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ} (المؤمنون: ٢)

واتە: ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخوا ترسن (گەردن کەچن بۆ خوا.

٣. "نوێژ"بەندایەتی هەموو ئوممەتەکان بووە. { وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ }(الأنبياء: ٧٣)

واتە: وە ئەوانمان کرد بە پێشــــەوا بە فەرمانی ئێمە ڕێنموونی (خەڵکیان) دەکرد وە نیگامان کرد بۆیان، ئەنجامدانی کاری چاك و نوێژکردن و زەکات دان وە ئەوان هەر بۆ ئێمە عیبادەتیان دەکرد.

٤. خوای گەورە بە موسا دەفەرموێ سەلامی خوای لێبێ: {وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ }(طه: ١٤)، واتە: نوێژ بکە هەرکاتێ منت یادکەوتەوە یان لەبەر ئەوەی من باسم کردووە یان بۆئەوەی بەیادی منەوە بژی.

٥. عیسا دەفەرموێ سە لامی خوای لەسەر بێ: { وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَـٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا } (مريم: ٣١) واته: وه پیرۆزو فەرداری کردووم لە هەر جێگایەکدا بم و فەرمانی پێداوم بە نوێژ کردن و بە زەکات دان، هەتا لە ژیاندام و زیندووم.

٦. ئیبراهیم دەفەرموێ سەلامی خوای لێبێ: { رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِيٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ} (إبراهيم: ٣٧)

واته: ئەی پەروەردگارمان من هەندێ لە ڕۆڵەکانم نیشتەجێ کرد لە شوێنێکی بێ کشتوکاڵدا لای ماڵە پیرۆز و ڕێزگیراوەکەت ئەی پەروەردگارمان تا بە چاکی نوێژ بەجێ بێنن بەڵکو دڵی خەڵکانێ وا لێبکەیت سۆزیان بێ بۆ لایان و لە هەموو بەر و میوەیەکیش ڕۆزیان بدە بەڵکو شوکرانە بژێرن.

کەواتە ئامانجی سەرەکی بردنی هاجەرەو ئیسماعیل بەرپا کردنی "نوێژ" بووە.

٧. وەدەفەرموێ و نزا دەکا: { رَبِّ ٱجۡعَلۡنِي مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِيۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلۡ دُعَآءِ } (إبراهيم: ٤٠)

واتە: ئەی پەروەردگارم من و ڕۆڵەکانم وا لێبکەی بە چاکی نوێژەکان بەجێ بێنین، ئەی پەروەردگارمان پاڕانەوە و نزاکەم وەرگرە.

٨. خوای گەورە دەربارەی ئیسماعیل دەفەرموێ: { وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا } (مريم: ٥٥)

واتە: وە هەمیشــە فەرمانی دەدا بە خێزان و کەس کاری بە نوێژکردن و زەکات دان وە هەمیشە لای پەروەردگاری جێگەی ڕەزامەندی بوو.

١٠. دەربارەی پێغەمبەری خاتەم دەفەرموێ علیەالصلاة والسلام: {وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ } (طه: ١٣٢)

واتە: فەرمان بە کەس و کارو ماڵ و مناڵت بکە با "نوێژ" بکەن وە ئارامیان لەسەر بگرە.

١٠. یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام، هەر وەک سەروەرمان دەفەرموێ: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ ".رواه‌البخاری }

١١. "نوێژ" هۆکارێکە بۆ ئەوەی ئیماندار سەر فراز بێ و میراتگری فیردەوس بێ: { قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ }(المؤمنون: ١). {ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَـٰشِعُونَ} (المؤمنون: ٢) {وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ } (المؤمنون: ٩) {أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْوَٰرِثُونَ } (المؤمنون: ١٠){ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ} (المؤمنون: ١١).

کەواتە : سەربەرزی، بوونە میرات بەری فیردەوس یەکێک لەهۆکارەکانی نوێژ کردن بە گەردن کەچی و پارێزگاری کردنە لە روح و کات و شوێن و ئامانج و ئادابەکانی.

١٢. نوێژ" مرۆڤی مسوڵمان دەپارێزێ لە (هلوع) کە بریتی یە لە خۆ ڕانەگری لە خۆشی و ناخۆشیدا: {إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا} (المعارج: ١٩)

واتە: بێگومان ئادەمی دروست کراوە بە چاو چنۆکێکی تەنگەتیلکە.

{ إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا } (المعارج: ٢٠) واتە: کە ناخۆشی یەکی تووش بێ هاوارو ناڵە دەست پێ دەکا .

{ إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ }(المعارج: ٢٢ ) واتە: مەگەر نوێژکەران .

{ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا }(المعارج: ٢١)

واتە: کە سامانیش ڕووی تێ بکات ئەی گرێتەوە لە خەڵکی.

{ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ } (المعارج: ٢٣)

واتە: ئەوانە کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان.

کەواتە بەردەوامی لەسەر نوێژ مرۆڤ لەو خەسڵەتە ناشیرنە دەپارێزێ، کە خۆ ڕانەگریە، لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەبون و نەبوندا، لە نەخۆشی ساغیدا.

١٣. یەکەم ئەرکی ئیمانداران لەعیبادەتەکاندا کاتێک دەسەڵاتدار بون گرنگی دان بە"نوێژە " :{ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْاْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ } (الحج: ٤١)

واتە: ئەوانەی ئەگەر دەســـەڵاتمان پێدان لە زەوی دا بەچاکی نوێژ بەجێ دێنن، وە زەکات دەدەن و فەرمان دەدەن بەچاکە و بەرگری دەکەن لە خراپە و سەرئەنجامی هەموو کارەکان تەنها بەدەست خوایە.

١٤. گرنگی دان بەشوێنی "نوێژ" کە مزگەوتەکانن، وە ئاوەدان کردنەوەیان، بە نوێژ خوێنانی ڕاستەقینە دەکرێ {إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَـٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ فَعَسَىٰٓ أُوْلَـٰٓئِكَ أَن يَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ } (التوبة: ١٨).

واتە: بەڕاستی مزگەوتەکانی خوا ئاوەدان دەکاتەوە کەسێك کەبڕوای هێنابێت بەخوا و بە ڕۆژی دوایی و نوێژەکانی بەجێ هێنابێ و زەکاتی دابێ و لەکەس نەترسابێ بێجگە لەخوا، جا بەڵکو ئەوانە لەو کەسانە بن کە ڕێنموونیی کراون.

١٥. "نوێژ" بەتەمبەڵی کردن، پیشەی دوو ڕووەکانە، ئەدی ئەوەی کەهەر نایکا: {إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا} (النساء: ١٤٢)

واتە: بەڕاســـتی دووڕووەکان دەیانەوێت خوا بخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە هەرکاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی و سستی هەڵدەســـتن، ڕوپامایی بۆ خەڵکی ئەکەن، وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت.

١٦. لەزەقترین سیفەتی بێ باوەڕان نوێژ نەکردنە: {أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ } (الماعون: ١) واتە: ئاخۆ دیت ئەوکەسەی کە بڕوای بە ئایین نی یە؟

{....... فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ} ، (الماعون: ٤) واتە: ئینجا وای بۆ نوێژ کەران.

{ ..... ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ }(الماعون: ٥). واتە: ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان.

١٧. لە نوێژ دا خوای گەورە مزگێنی یەحیای بەزەکەریا دا سەلامی خوایان لەسەربێ: { فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ} (آل عمران: ٣٩ )

واتە: جا فریشـــتە بانگی لێکرد لەکاتێکدا کە زەکەریا لە میحرابەکەدا وەســـتابوو، نوێژی دەکرد، بەڕاســـتی خوا مژدەت دەداتێ بە (کوڕێک ناوی) یەحیایە کە بڕواهێنەرە بە عیســـای وتەی خوا و پێشـــەوایە وە جڵەوگری نەفسی خۆیەتی، وە یەکێکە لە پێغەمبەرانی چاک کردار.

١٨. نوێژ کۆڵەکەی دین و دینداریە، پێغەمبەری خوا دەفەرموێت، علیه الصلاة والسلام: {رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ.} رواەالترمذی.

١٩. یەکەم شتێک کە لە دوا ڕۆژدا خوای گەورە بەندەکانی لەسەر مو حاســـەبە بکا لەمافی خۆی لە دوای ئیمان "نوێژەکانن" : {إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَـــبُ النَّاسُ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ أَعْمَالِهِمُ الصَّـــلَاةُ. } رواه أبو داود. حكم الحديث: صحيح.

٢٠. خوای گەورە بەڵێنی داوە بەوانەی کە "نوێژ" بەزایا دەدەن، و شوێن ئارەزوەکان دەکەون، بیانخاتە دۆزەخ : {فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا } (مريم: ٥٩).

واتە : ئینجا لە پاش ئەوان کەســـانێك (لە نەوەکانیان) بوونە جێنشـــینیان کە نوێژیان دەفەوتاند و شـــوێن هەواو ئارەزوو کەوتن جا ئەوانە لە داهاتوودا تووشی (سزای) گومڕاییان دەبن.

٢١. خوای گەورە ناوی لە "نوێژ" ناوە ئیمان: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾(البقرة: ١٤٣)

مەبەســـت لە ئیمان ئەو نوێژانەیە کە ڕوویان لە بیت المقدس کردبوو پێش ئەوەی ڕوو لەکەعبە بکەن وەفاتیان کرد، جا مو نافیق و جوەکان دەیان وت نوێژەکانتان بەزایا چوە خوای گەورە وەڵامی داناوە و بێدەنگی کردنو بیانوی بڕین.

٢٢. "نوێژ" ئەوکارەیە کە بەس بۆ خوا ئەنجام دەدرێ، وە پێش هەموو کارێکی باش دەخرێ: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾(الأنعام: ١٦٢). واتە: ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)، بڵێ بێگومان نوێژ، و (بەندایەتی)، و قوربانی، و ژیان، و مردنم، هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە.

٢٣. خوای گەورە لە ناشـــیرنترین ســـیفەتی بێ باوەڕەکان کەباسی دەکا "نوێژ" نەکردنە، کەلەکاتی سەرە مەرگا قاچەکانیان لێک باهەڵدەدرێن و روویان ڕەش دەبێ:

{ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ }(القيامة: ٣١) واتە: جا (کافر) نە بڕوای هێناو نە نوێژی کرد.

{ وَلَـٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ }(القيامة: ٣٢) واتە: بەڵکو ئایینی بەدرۆ دەزانی و پشتی تێ دەکرد.

٢٤. "نوێژ" یەکێکە لەو خەسڵەتە جوانانەی کە مرۆڤ پێی دەبێتە برای دینی مسوڵمانان: { فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخْوَٰنُكُمْ فِي ٱلدِّينِ وَنُفَصِّلُ ٱلْءَايَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ }(التوبة: ١١)

واتە: ئینجا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێ هێنا، و زەکاتیان دا ئەوە براتانن لە ئاییندا وە ئێمە بەڵگەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ گەلێك کە دەیزانن.

٢٥. یەکێکە لەو خەسڵەتە ناشیرنانەی کەمرۆڤ پێی دەبێتە زیندانی، و بارمتەی کردەوە خراپەکانی، و پێی دەچێتە دۆزەخ: {مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ} (المدثر: ٤٢). واتە: هەر لە بەهەشتی یەکان وەڵام ئەداتەوە کە دیومانن و پێمان وتوون چی ئێوەی خستووەتە دۆزەخەوە.

{ قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ } (المدثر: ٤٣) ئەوانیش وتیان: ئێمە لە نوێژ کەران نەبووین.

٢٦. نابێ بەسەرخۆشی نوێژ بکەین جا چ سەرخۆشی و مەستی شەراب بێ، یان مەســـتی بێهۆشی بەهۆی دونیا بێ: { يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ........ } (النساء: ٤٣).

٢٧. "نوێژ" نزیک بونەوەیە لە خوای گەورە: { كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب} (العلق: ١٩) واتە: نەخێر، بە گوێ ی(ئەو کەسانە)مەکە، وە کورنوش بەرە و (لەخوا)نزیک بکەوەرەوە.

٢٨. "نوێژ" هێزو وزە بە مرۆڤی مسوڵمان دەبەخشێ: {وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ} (البقرة: ٤٥). واتە: داوای یارمەتی بکەن لەڕێی ئارامگرتن و نوێژ، بەڕاستی ئەرکێکی گرانن، جگە لەسەر خاشیعەکان نەبێ.

٢٩. پێویستە پێش "نوێژ" خۆمان پاک کەینەوە لەهەموو بێ نوێژیەک، جا جەنابەت بێ، یان بێ دەست نوێژی بێ: {يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ} (المائدة: ٦)

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕدارن، ئەگەر هەستان بۆ نوێژ کردن ئەوە دەموچاوتان بشۆن هەروەها دەستەکانتان تا ئانیشکەکانتان، وە دەستی تەڕ بهێنن بەسەرتان دا، وە پێیەکانتان(بشۆن) تا هەر دوو قولە پێتان، وە ئەگەر لەش گران بوون ئەوە خۆتان خاوێن بکەنەوە (خۆتان بشۆن) وە ئەگەر نەخۆش بوون، یان لە سەفەردا بوون، یان کەسێکتان هاتەوە لە شوێنی پێویستی سەرئاو، یان جووت بوون(یا پێستان بەر یەك کەوت) لەگەڵ خێزانەکانتاندا و ئاوتان دەست نەکەوت، ئەوە تەیەموم بکەن بە خۆڵیکی پاك جا دەست بهێنن بە دەم و چاو و دەستەکانتان دا بەو تۆز و خۆڵە پاکە، خوا نایەوێ هیچ جۆرە تەنگی و نارەحەتیەك لە سەرتان دابنێ بەڵکو ئەیەوێ پاکتان بکاتەوە و چاکە و بەهرەی خۆی تەواو بکات بەسەرتانەوە، بەڵکو سوپاسی بکەن.

ئاگامان لێ بێ لەوەی کەرێگریەکانی نوێژ روحی نەبن، چونکە نوێژی راستە قینە ئەوەیە کە بەدڵ و گیان بێ نەوەک لاشە بەتەنیا.

٣٠. نوێژ رێگری دە کا لەتاوانی گەورەو بچوک، دیارو نادیار، رەفتارو گوفتار: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ

ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴾(العنكبوت: ٤٥)

واتە: بیخوێنەرەوە ئەو قورئانەی کە سرووش کراوە بۆت وە نوێژ بکە بێگومان نوێژ بەرگری (نوێژکەر) دەکات، لە کاری ناشرین و ناپەسەند (خراپە)، وە زیکرو یادی خوا گەورەترە (لە هەموو شتێك) خواش بەهەر کارێك کە دەیکەن دەزانێ.

٣١. "نوێژ" نورو ڕۆشنایيە، لەدوا ڕۆژدا، کە مرۆڤ لەهەرکات زیاتر پێویستی بەڕووناکیە لەدوا ڕۆژدا: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ....وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ، وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ. كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو، فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا.} رواه مسلم.

٣٢. ڕەبیعەی کوری کەعبی ئەسلەبی داوای لە پێغەمبەر عليهالصلاةوالسلام کرد لەبەهەشتا هاوەڵی بێ، ئەویش فەرموی {فَأَعِنِّي عَلَى نَفْسِكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ. رواه مسلم.}

٣٣. مسوڵمان کە گوێی لەبانگ بو، دەبێ بروا بەدەمیەوە جا بۆ نوێژی جومعە بوو یان نوێژەکانی تر: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ

ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ

} (الجمعة: ٩)

واتە: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە کاتێك کە بانگ درا بۆ نوێژ لە ڕۆژی هەینی دا بە پەلە بڕۆن بۆ یادی خوا (و نوێژە هەینی) و واز لە کڕین و فرۆشتن بهێنن، ئا ئەوە بۆ ئێوە چاکترە ئەگەر بزانن و تێ بگەن.

٣٤.  دڵ بە مزگەوتەوە گرێدران، هۆکاری کەوتنە بەر سـێبەری عەرشی خوایە لە دوارۆژدا، { سَــبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ يَوْمَ لَا ظِلَّ إِلَّا ظِلُّهُ : الْإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَـابٌّ نَشَـأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌفِي الْمَسَـاجِدِ، وَرَجُلَانِ تَحَـابَّا فِي اللَّهِ ؛ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ، وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ، وَجَمَالٍ فَقَالَ : إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ أَخْفَى حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ}."

٣٥.  چاوەڕوانی نوێژ لەدوای نوێژ وەک سـەنگەرگرتن وایە لە دوژمنانی دین: {" أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الْخَطَايَا، وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ ؟ " قَالُوا : بَلَى، يَا رَسُـولَ اللَّهِ. قَالَ : " إِسْـبَاغُ الْوُضُـوءِ عَلَى الْمَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الْخُطَا إِلَى الْمَسَـاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ } رواه مسلم.

٣٦.    ئیماندارانی ڕاستەقینە، ئەوانەن کە شەو ئۆقرە ناگرن لەسەر جێگاکانیان تا هەڵنەستنەوە بۆ شەو نوێژ: { تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ }(السجدة: ١٦)

واتە: تەنشـــتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.

٣٧.   عِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ  بەندەکانی خوای میهرەبان، ئەوانەن کە لە خزمەتی پەروەردگاریان شەو دەکەنەوە: { وَعِبَادُ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى ٱلْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلْجَـٰهِلُونَ قَالُوا۟ سَلَـٰمًا}  (الفرقان:٦٣ )  {وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَـٰمًا }(الفرقان: ٦٤)

واتە: وە کەسـانێکن لە شـەودا بۆ پەروەردگاریان سـوژدەبەرن و شـەو نوێژ دەکەن.

٣٨.    خوای گەورە داوا لەپێغەمبەرو شـــوێن کەوتوانی دەکا لەشـــەودا بەخەبەر بن، جـا یان بەشـــە هەرە زۆرەکەی، یان نیوەی، یان کەمتر

لەنیوەی، یان شتێک زیاتر لەنیوەی، واتە دەبێ شەو هەر بێدار بێ بەپێی توانا: { قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا} (المزمل: ٢)

واتە: شەو هەستە (شەو نوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت.

{نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا} (المزمل: ٣).

واتە: نیوەی یان کەمێ لە نیوەی کەم بکەرەوە.

{ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا } (المزمل: ٤)

واتە: یا کەمێ لێی زیاد بکە وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەر خۆیی واتە بە ڕێك و پێکی.

٣٩. ئەو کەسەی لەشەودا بێدارەو لەسەجدەو خواپەرستیدایە، وەک ئەوە وایە کە لەجێگادا خەوتوەو بێئاگایە!؟ {أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ} (الزمر: ٩)

واتە: هاوبەش دانەران چاکترن یا کەسێ ملکەچ و پەرســـت کارە (بۆ خوا)، لە کاتەکانی شـەودا بە سـوژدە بردن و ڕاوەسـتان (لە شـەو نوێژدا) کە لە (سزای) دوا ڕۆژ دەترســـێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی (ئەی موحەممەد(صـــلی الله علیه وســـلم))، بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکســـانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن بەڕاســـتی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

٤٠. ئەهلی کیتاب هەموویان وەکو یەک نین بەتایبەت ئەوانەیان لەشەودا بێدارن و شەونوێژ دەکەن و قورئان دەخوێنن: ﴿ لَيۡسُواْ سَوَآءً مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴾(آل عمران: ١١٣)

واتە: هەموو(نامەدارەکان) چوون یەک نین لەناو خاوەن نامەکاندا دەســتەیەک ڕاســت و ڕێک هەن ئایەتەکانی خوا دەخوێنن لە (کاتەکانی شەودا وە لە(کاتەکانی) کڕنوش بردنیاندا.

٤١. یەکێـک لەبەڵگەکـانی گەورەیی نوێژ ئەو هەموو جۆراو جۆریەی نوێژە.

٤٢. نوێژە فەرزەکان: نیوەڕۆ، عەسر، شێوان، عیشا، بەیانی.

٤٣. ســـونەتە ڕاتبەکان: دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی، چوار یان دوو پێش نیوە ڕۆ، دوو رەکات دوای نیوەڕۆ، دوو رەکات دوای شـــیوان، دوو رەکات دوای عیشا.

٤٤. بێجگە لە راتبە موئەکەدەکان: چوار رەکات دوای نوێژی نیوەڕۆ، چوار پێش عەسر، دوو پێش مەغریب.

٤٥. نوێژی جومعە.

٤٦. نوێژی جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان.

٤٧. نوێژی جەنازە.

٤٨. نوێژی داوا کردنی باران.

٤٩. نوێژی ڕۆژ گیران.

٥٠. نوێژی مانگ گیران.

٥١. نوێژی ڕوودانی هەر بەڵاو موسیبەتێکی گەورە.

٥٢. نوێژی چێشـتەنگاو لە دووركاحەت تا هەشـت رەکات یان دوازدە رەکات.

٥٣. نوێژی وەتر لە یەک رەکاتەوە، لەیەک رەکاتەوە تا سێزدە رەکات یان یازدە یان کەمتر یان زیار بە شەو نوێژەکانەوە.

٥٤. نوێژی دیاری مزگەوت.

٥٥. نوێژی تەوبە کردن.

٥٦. نوێژی دەست نوێژ.

٥٧. نوێژی پێش مردن و شەهیدبون، هاوەڵان کردویانە.

٥٨. نوێژی شەوی ژن گواستنەوە هەندێک لەزانایان فەرمویانە.

٥٩. نوێژی ئیستیخارە.

٦٠. دوورەکاتی تەواف.

٦١. نوێژ لە مەقامی ئیبراهیم...

٦٢. باس لەنوێژی فەتح و سەرکەوتنیش دەکرێ.

٦٣. نوێژی نەزر کەلەسەر خۆی نەزر کردبێ پێویستە ئەنجامی دا بۆ خوا.

٦٤. ئەنجامدانی زۆربەی نوێژەکان بەجەماعەت.

٦٥. نوێژ بەهۆی ســـەفەرو نەخۆشـــیەوە ناچێ بەڵکو کورت یان کۆ دەکریتەوە.

٦٦. بەهۆی ترسەوە ناچێ کۆ دەکرێتەوەو کورت دەکرێتەوە.

٦٧. بەهۆی لە بیرچونەوە، یان خەو، یان ســـەرقاڵبون ناچێ، بەڵکو یەکسەر دوای هەستان و بیرکەوتنەوەو لاچونی سەرقاڵی ئەنجام دەدرێ.

٦٨. تەنها لەبەر بیانوە شـــەرعیەکان وەک ســـوری مانگانە، یان منال بون ئەنجام نادرێ دەنا بیانو نیە بۆ چواندن.

٦٩. ئەگەر ئاو نەبو تەیەموم دەکرێ.

کەواتە بائاگامان لە نوێژەکانمان بێ مادام ئەوەندە گەورەو گرنگە.

## بەشی دووەم

## فەلسەفە و حیکمەتی نوێژ

( باسی حیکمەتی دروست بونی شەیتانیش لەم باسەدا هەیە)

گومان لەوەدا نیە کە "نوێژ" یەکێکە لە گەورەترین بەندایەتیەکان کە خوای گەورە لەسەر بەندەکانی پێویست کردوە، مادام فەرمانی خوایە حەتمەن پریەتی لە حیکمەت و قازانج بۆ بەندەکان لەدین و دوا ڕۆژدا، حیکمەت و گەورەیی نوێژ لە قورئانی پیرۆزدا ڕونکراوەتەوە، وە دەبێ ئەوە بزانین کە عیبادەت و هەمووبوارەکانی تر خاوەنی فەلســـەفەو حیکمەتی هاوبەش و تایبەتین، بۆیە بە گشتی باسی فەلسەفەی عیبادەت دەکەین و فەلسەفەی نوێژ بەتایبەتی.

١. بەندایەتی ئەو ئامانجەیە کە مرۆڤ و جنۆکەو فریشتەو هەموو دروستکراوەکانی لەپێناودا بەدی هاتوە: { وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} (الذاريات: ٥٦)

واتە: وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروستکردووە کە بەندایەتی من بکەن. وە هە موو بونەوەر تەسبیحاتی خوا دەکا، تەسبیحاتیش عیبادەتە بۆ خوا: { تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا} (الإسراء: ٤٤).

واتە: ستایشی خوا دەکەن هەر حەوت ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی لە ناویاندایە وە هیچ شتێك نیە کە سوپاسی ئەو ستایش نەکات بەڵام ئێوە تێ ناگەن لە تەسبیحاتەکەیان بەڕاستی خوا هەمیشە پەلەنەکەری لێبوردەیە.

٢. گەورەترین حیکمەت ئەوەیە کەئێمە فەرمانی خوا جێ بەجێ دە کەین کە لە دەیان شوێن دەفەرموێ نوێژ بکەین.

٣.   ئێمە بە نوێژ دین و ڕێو شـــوێنی پێغەمبەران زینـدو دەکەینەوە کە هەموویان نوێژیان کردوە.

٤.   ئێمە بەو کارەمان دژایەتی شەیتان دەکەین کە خوای گەورە ئەوی بە دوژمن بە ئیمە ناساندوە، چونکە شەیتان ئامادە نەبو کڕنۆش و ملکەچی بۆ خوا دەربڕێ: ﴿ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ﴾ (فاطر: ٦)

واتە: بەڕاسـتی شـەیتان دوژمنی ئێوەیە دەیکەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن، بێگومان ئەو(شـەیتان) تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببەنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرسـاوی دۆزەخ. وەدەبێ وەک دوژمن مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.

٥.   پێم خۆشـــە کە ئێمە باسی فەلســـەفەی عیبادەت دەکەین، وە دوژمنـایەتی بۆ شـــەیتـان ئیعلان دەکەین بـابزانین حیکمەت لە خەلقی شـــەیتان چیە ؟ کە زۆر جار ئەو پرســـیارەمان لا دروســـت دەبێ، ئەوە وڵامەکەیەتی بەکورتی و پوختی،

- مرۆڤی مســـوڵمان دڵنیایە کە خوای گەورە کار لەجێیە و هیچ کارێکی بێ حیکمەت ناکا چونکە ناوی حکیم و علیم و خبیر و لطیفە.

- شەیتان بۆ ئەوە دروست نەبوە وای بەسەر بێ بەڵکو بۆ عیبادەت دروست بوە خوای گەورە دەفەرموێ: {وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ} (الذاريات: ٥٦)

واتە: وە من جنۆکە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن. بەڵام شەیتان لەبەر ئەوەی کە ئازاد بو ئازادیەکەی خراپ بەکار هێناو گومرا بوو. {وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا} (الكهف: ٥٠)

واتە: بیریان بهێنەرەوە کاتێك بە فریشـتەکانمان وت سـوژدە بەرن بۆ ئادەم ئەوانیش هەموو سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس نەبێت کە لە پێرِی پەرییەکان بوو، بۆیە لە فەرمانی پەروەردگاری دەرچوو دەی ئایا ئێوە (ئەی ئادەمیزادەکان) ئەوو نەوەکەی دەکەن دۆسـت و پشـتیوانی خۆتان لە جیاتی من لە کاتێکدا کە ئەوان دوژمنی ئێوەن ئای چ گۆڕینەوەیەکی خراپە بۆ ستەمکاران. کان من الجن ففسق عن أمر ربه.

- مرۆڤ دەسەڵاتی نەبوە نە لە هاتن و نەلەمردن نە لە نێر و مێ یایەتی و هتد، وە ئەو مرۆڤە مادام هەست بە بێ دەسەلاتی خۆی دەکا ژیرانە ئەوەیە کە خۆی رزگار کا نەوەک بلێ بۆ؟، وەک ئەو کەسەی لەسواری فرۆکەیەک بێ لەئاسمان کاپتنەکە بلێ ئاگادار بن، خۆتان ئامادەکەن، قیناع ببەستن، سەرتان داخەن، ئەمە دەرگایەکانن، ئایا ئەو سەرنشینانە کاری ژیرانە ئەوەنیە خۆیان ئامادە بکەن یان بلێن بۆ؟ دەی دیارە مادام ئێمە لێرەین با خۆمان دەربازکەین نەوەک خەریکی ئەوە بین بلێین بۆ؟
- شەیتان ئازاد بو ناچار نەبو بۆ گوناهکردن کەواتە بۆ گلەیی لەخوادەکرێ؟!
- لەهەمو دونیا ئازادی جیگای شانازیە وەخەڵک داوای دەکا دەی باشە خوای گەورە کە مرۆڤی ئازاد کردوە بۆ گلەی دەکرێ لە خوای گەورە !.
- ژیان تاقیکردنەوەیە، جنۆکەو مرۆڤ بۆ تاقیکردنەوە دروست بون (لیبلوکم) لەهەمو سیستەمەکانی دونیا گەیشتن بەپلە باڵاکان لەهەر بوارێک دەبێ بەتاقیکردنەوە دا تێبپەرێ، کەسیک بێ تاقیکردنەوە بەرز بێتەوەو شەهادە وەر بگرێ خەڵک متمانەی پێ ناکاو گاڵتەیان پێ

دێ، باشـــە بۆ لەهەق هەموو مرۆڤایەتی تاقی کردنەوە باشـــە بەلام لەهەق خوا دا خراپە؟!.

- ئێمە لە بونەوەردا شـــتێکی بێ حیکمەت نـابینین، ئەی بۆ دەبێ شەیتان، مرۆڤ، جنۆکە بێ حیکمەت بن؟.
- خوای گەورە هەمو ئامرازەکانی تاقیکردنەوەی لەبەردەم مرۆڤایەتی داناوە، کەواتە ئێمە حەقی گلەییمان نیە .
- یەکێک بۆی هەیە بڵێ جا بۆ تاقیمان دەکاتەوە؟ دەڵێین، لایسـئل عما یفعل وهم یسـئلون پرسـیار لەخوا ناکرێ بەڵکو پرسـیار لەئێمە دەکرێ بۆ لەتاقی کردنەوەکە دەرنەچوی؟ بۆ خۆتـت ئامادە نەکرد؟ بۆ دەرنەچوی؟ چت نوقسان بو؟ وەهەروەها:
- خوای گەورە شـــەریعەت و پێغەمبەرانی بۆ ئێمە ڕەوانە کردوە بۆ ئەوەی بەرچاومان ڕوون بێ و فریونەخۆین و ڕێگای راست بدۆزینەوە.
- خوای گەورە شـەیتان و شـەیتان سـیفەتەکانی بە ئێمە ناسـاندوە بۆ شوێنیان دەکەوین؟!
- خوای گەورە دۆزەخ و بەهەشتی بۆ داناوین بۆ ئەوەی پابەندمانکا، ئەمەش لەرەحمەتی خۆیەتی .

- خوای گەورە زۆر جار پێش قیامەت سزامان دەدا بۆ ئەوەی بەئاگا بێینەوە نابێ بڵێین بۆ؟ چونکە هەمو سیستەمەکانی سەرزەوی یەکدەنگن لەسەر بونی سزا، ناشکرێ هەمو مرۆڤایەتی بەهەڵەداچوبێ.
- ناکرێ ئێمە بەخوا بڵێین بۆ شەیتان یان ئێمەت دروست کردوە چونکە ئەمرو خەلق تایبەتە بەخۆی، هەروەک هیچ کام لە ئێمە قبوڵ ناکا پرسیارە تایبەتیەکانی لێ بکرێ کە زۆر تایبەتن بەخۆی وەک بڵێی لوتت بۆ وایە؟ باڵات بۆ کورتە؟ بۆ واناشیرنی؟ ' مناڵەکەت یان خیزانەکەت هتد... بۆ وایە؟ یەکسەر دەڵێ مەیەرە ناو ژیانی تایبەی من، ئەی تۆ چۆن لەخوای گەورە ئەو پرسیارانە دەکەی؟.
- خوای گەورە حیکمەتی هەموو شتەگرنگەکانی بۆ رونکردوینەوە لەژیاندا ئیتر بیانویەکمان نەماوە .
- خوای گەورە گوناهەکانمان بەیەک بۆ حساب دەکا، بەڵام چاکەکان یەک بە دە یان سەدان و هەزاران .
- ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە ئازادی و تاقیکردنەوە دەکرێ بۆ دەبێ ئێمە ئازادبین بۆ ئەوەی داهێنان بکەین ئەگەر وەک فریشتە باین زەوی ئاوەدان نەدەبۆوە .

- با ئێمە تەماشـــای رەحم و گەورەیی خوا بکەین، دەبینین تەنها مرۆڤ و جنۆکە ئازادیان هەیە، کەچی ئەوان ژیانیان تاڵ کردووەو ژیان و ژینگەیان تێک داوە، ئەی باشــە ئەگەر ڕۆژ و مانگ و هەســارەکان ئازاد بان دەبو چ ڕوی دابا! .
- دەرکەوتــوە دیــن مــرۆڤ بەخــتەوەر دەکــا، مەگەر مــرۆڤ لەبەختەوەری ناگەرێ؟ بەڵام بەمەرجێک دین بەراســتی جێ بەجێ بکرێ، کەواتە دەبێ ئێمە خۆمان بەقەرزار بزانین یان نارازی بین؟!.
- لەدین دا فەلســەفەی ژیان ڕوونە بەڵام لەئیلحادو ماددی گەراییدا مرۆڤ نوقمی بەدبەختی و ئاشــوب و بەڵا دەبێ، ئایا تێ گەیشــتن لە فەلسەفەی ژیان باشە یان خراپە؟
- ئەوانەی ئەوجۆرە پرســیارانە دەکەن وەڵامیان بۆ پرســیارەکەی خۆیان پێ نیە، بەدیلیش قەبوڵ ناکەن ئەی چارەیان چیە؟ .
- زۆربەی مرۆڤـایەتی بڕوای بەخوا هەیە بەشــێـک لە مرۆڤـایەتی مولحیدە، وەزۆربەی مولحیدەکانیش اللامنتمین، واتە بەدوی ئەوەدا نـاچن ئەوە بۆ وایە ئەوە بۆ وایە بەڵکو حەز دەکەن ڕابوێرن بۆیە لە جۆرە پرسـیارانە ڕادەکەن، چونکە ئەگەر پرسـیارکەن دەبێ کۆڵنەدەن

و دواتر بە نەتیجەی لێکۆڵینەوەکەیان پابەند بن، ئایا ئەوان ئەوەیان دەیەوێ؟ یان دەیانەوێ ڕابواردنەکەیان لێ تێک نەچێ؟.

- لەکۆتایدا ئیماندار گەلێک شادومان و بەختەوەرە کە فەلسەفەی حەیاتی لاڕونە و داهاتویەکی مسۆگەری هەیە، لەڕوانگەی ئیمانەوە لەهەموشتە بنچینەییەکان تێ دەگا، بەڵام کاکی مولحید سەرلێ شیواوەو خۆی بزر کردوە. {فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ} (الأنعام: ٨١).

- رۆژێک گویم لە مولحیدێک بو لەگەڵ بانگخوازیک گفتوگۆی دەکرد دەیوت چۆن دەکرێ پرسیاری هەمومان یەک بێ لەکاتیکدا ژیری ئێمە جیاوازی هەیە؟! وەڵام بەکورتی و پوختی ئەوەیە: خوای گەورە پرسیاری سادەی ئاراستەی هەمومان کردوە خویندەوارو نەخویندەوار بەئاسانی تێی دەگات، باسی کیمیاو فیزیاو جەبرو هەندەسەو پزیشکی نیە،

پێی وتوە خوات کێ یە؟

پێغەمبەرت کێ یە؟

دینت کامەیە؟

بۆ دروست بوی؟

کێ دروستی کردوی؟

داهاتوت بۆ کوێ یە؟

دەکرێ ئەگەر خوێندەواریش نەبی لەرێی پرســـیارەوە لەم وەڵامانە تێ بگەی .

- جەنابی مولحیدەکان، شـــەیتان هێشـــتا ماوەو نەمردوە بۆ ناچن پرسـیاری لێ بکەن بڵێن جەنابی شـەیتان بۆ ماڵی ئێمەو خۆشـت خەرا کرد بۆ بەو رۆژە رەشەت گەیاندین !.
- بە هۆی شـــەیتانەوە پێشـــبڕکێو کێشـــمەکێش پەیدا بوە، کە ئەمە هۆکاری پێشکەوتنە، چونکە کێ بەرِکێ هۆکاری پێش کەوتنە.
- ئێمە دوو نمونەمان هەیە نمونەی ئادەم کەتاوانی کردو پەشـــیمان بۆ وە خوای گەورە تەوبەی قەبوڵ کردو هەڵی بژاردو کردییە پێغەمبەر دونیاو دوا رۆژی بردوە، وە نمونەی شەیتانیشمان هەیە کەتاوانی کرد و پاسـاوی نادروسـتی بۆ خۆی هینایەوە بۆ یە دین و دونیای دۆراند، جا ئەوکەســـەی بەدوای ئەوکەســـە دوراوە دەکەون بۆ دەبێ گلەیی بکەن کاتێک هەمان سەرەنجامیان دەبێ .

- چەندین پلەی باڵای بەندایەتی هەیە کە مرۆڤ بە هەوڵدان و خۆماندو کردن نەبێ نایگاتێ، بۆیە بەهۆی شەیتان و شەیتان سیفەتەکانەوە ئەم پلانە بەدەست دێن کە ئەمەش حیکمەتی خۆی هەیە .
- ئادەم ژیانی دوای گوناهکردنی باشتر بو لەپێش تاوانکردنی بەهۆی تەوبەوە، کەواتە مەرج نیە ئەگەر تاوانمان ئەنجام دا کۆتایی بەهەموو شتێک بێ، بەڵکو لەوانەیە هۆکاری پێش کەوتن بێ لەهەموو بوارەکانی ژیان یان زۆربەی بوارەکان.

٦. مرۆڤ لە دوو بەشی سەرەکی پێک هاتوە، لاشە، روح، گرنگی مرۆڤ بەروحەکەیەتی نەوەک بەبەدەنەکەی، بە بەڵگەی ئەوەی کە لاشە روحی تێدا نەما هەمووان لێی بێزار دەبین بەپەلە خۆی لێ ڕزگار دەکەین، هەتا نزیکترین کەسەکان دەیانەوێ لەبەرچاویان نەمێنێ، دیارە چۆن لاشەی مرۆڤ پێویستی تایبەتی خۆی هەیەو دەبێ بۆی دابین بکەین روحیش بەهەمان شێوەیە، بەڵام داخوازی و پێویستیەکانی لاشە هەنوکەیین و ناتوانین لەئەندازەی پێویست دوای بخەین، بەڵام پێویستیەکانی روح ڕاستە داخوازیەکانی هەنوکەین بەڵام دەرهاویشتەکانی درەنگتر دەر دەکەون،

بۆ نمونە ئەگەر تینومـان بوو دەبێ هەوڵـدەین دابینی بکەین، وە ئەگەر برسیمان بو دەبێ دابینی بکەین تەنیا تا ماوەیەک دەتوانین خۆمان ڕابگرین، وە گەرماو سەرماو شتەکانی تریش هەروان، هەرچەند جیاوازی لە نێوان غەیزەکاندا هەن بۆ وەڵام دانەوەی دەرنگی و زووی بۆیان ، دیارە پێداویستیەکان روح وەک شتەمادیەکان پێویستن بەڵام وەک برسیایەتی و تینوایەتی و گەرماو ســـەرمار زوو شـــوێنەواریان دەرناکەوێ، بەڵام فەراموش کردنی داخوازیەکـانی دڵ، روح، ژیری، لە کۆتـاییـدا هەموو شـــتێک لە کیس مرۆڤ دەدات، جا بۆیە بەندایەتیەکان کە داخوازی سروشتی و فیتری ناخمانن دەبێ گرنگیان پێ بدەین، بە شیوەیەکی گشتی معرفە و دونیـا بینی راســـتەقینە و بیرو بـاوەر دەوری بنچینە دەبینن، لەدوای ئەوە نوێژ زۆر کاری گەری هەیە لەســەر دڵخۆشی و پەروەردەی ناخمان، یەکەم لەژیانمان دا هەستی پێدەکەین، دووەم نمونە ی زۆرمان لەبەر دەستە لە ژیانی پێغەمبەران و پیاو چاکان، سێ یەم زانستی سەردەم پێمان دەڵێ ئەوانەی دیندارن لە ڕووبەڕووبونەوەی کارەســـاتەکاندا بە هێزترن، چوارەم بە بەڵگەی ئەوەی ئەوانەی کە مولحیدن زۆرترین ڕێژەن کە پەنا بۆ خۆکوشتن دەبەن.

٧. گرنگی نوێژ لەوەدایە کەپەیوەندی بەندە بە خواوە بەهێز دەکا، وە مرۆڤ بە شـێوەی تەندروسـت و ڕێک و پێک ئەنجامی دا هەسـت دەکا لە خزمەتی خوادا دەژی و هەست بەنزیکی و بێ پەردەیی دەکەی.

ئەم بابەتە، ئەهلی دڵ نەبێ هەســـتی پێ ناکا، بۆیە کەســـێک داوای بەڵگە بکات وەک ئەوە وایە بەکەسێکی برسی یان تینو بڵێ بەڵگەت چیە کە تینوی یـان برسی، چونکە ئەمە زانســـتێکی نـاخی و دەرونیە خۆت هەستی پێ دەکەی.

٨. مرۆڤ سەرقاڵی زۆرە، وەکیشەو گرفتی زۆری بۆ دیتە پێش وە خۆی فەرامۆش دەکـا بەڵام نـوێژ لەو ســـەرقـاڵیە دورمـان دەخـاتەوە، وە ئیسڕاحەت بە روح و لاشەمان دەدات .

٩. نوێژی فێری تەوقیت و ئاگادار بونمان لەکات دەکات، چونکە نوێژ تەوقیتی دیاری کراوی خۆی هەیە، لەوانەیە یەکێک بڵێ ســـەعات یان مۆبایل هەیە ئەم گرفتەمان بۆ چارەســـەر دەکا بەڵام ئەمە جیاوازە، چونکە کاتەکانی نوێژ لەئەرک و کاری ئـامـانج دا ئـاگـارمـان دەکاتەوە بەندایەتیمان بیر دەخاتەوە.

١٠. نوێژ بانگی بۆ دیاری کراوە : وەک واجبێکی پێش وەختە بۆ ئەوەی هەموو مسولْمانان وریا بنەوە کە بانگ دەکرێن بە ئەرکێکی دەستە جەمعی کە نوێژە.

١١. نوێژ شوێنی تایبەتی بۆ دیاری کراوە کە مزگەوتە: ئەم شوێنە تایبەتەو پاک و خاوینە وە دڵی سولْمان پێیەوە گریدراوە بەردەوام (ورجل قلبه معلق بالمساجد) وە سەروەرمان دەفەرموێ: عليه الصلاه والسلام. وە لەدەرەوەی مزگەوتیش ئەنجام دەدرێ، بەڵام مزگەوت ئامانجەکان زیاتر دەپێکێ .

١٢. لە فەلسەفەی نوێژ ئەوەیە کە بە شێوازی تایبەتی ئەنجام دەدرێ ئەویش جەماعەتە بۆ ئەوکەسانەی بیانوی شەرعیان نیە .

١٣. نوێژ پێویستە بە پاکترین حاڵەت پێویستە خۆی بۆ ئامادە بکەی ئەویش پاکیە لە بێ دەستنوێژی گەورەو بچوک، پاکی لاشە چەندە پێویستە، {ثِيَابَكَ فَطَهِّرْ} (المدثر: ٤) واتە: وە پۆشاکت بە پاك ڕابگرە.

لە پێش ئەوە دەفەرموێ: {وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ} (المدثر: ٣) واتە:وە پەروەردگارت بە گەورە بگرە.

لەدوای ئەوانە دەفەرموێ: {وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ} (المدثر: ٥) واتە: وە دەست لە گوناە هەڵگرە.

١٤. لەکاتی نوێژدا ئیمامێک هەیە بۆ ڕێکخستنی نوێژەکە بەو پەری جوانی و ڕێک و پێکی.

١٥. نوێژ کە بە ألله أكبر دەستپێ دەکا، لە دوای ئەوەی بەپاکی و بەرامبەری قیبلە و بەدەست نوێژەوە ڕادەوەستی ئەو أالله أكبرە هەموو شتێکت لێ حەرام دەکا بە غەیری نوێژ، پێی دەوترێ أالله اكبرى تحريم، واتە هەموو شت لە خۆت قەدەغە دە کەی بەغەیری نوێژ.

١٦. دواتر دوعای إستفتاح دەخوێنی، واتە کردنەوەی نوێژ چەندین دوعا هەیە، ئەمەش جۆرێکی ترە لەئامادەکاری بۆقوڵ بونەوە لەنوێژدا.

١٧. دواتر إستعاذە دەخوێنی واتە (أعوذ بالله) دەخوێنی ئەویش چەندین دەستە واژەی هەیە.

ئەم ڕستەیە لابردنی پەرچە لەبەردەم قوڵ بونەوە لە نوێژەکەت، چونکە گەورەترین ناحەزو دوژمن شەیتانە کەلەسەرڕێگات ڕاوەستاوە ڕێگرە لە بەخوا گەیشتن و گەیشتن بە ڕوحی عیبادەتەکان، کەواتە بە إستعاذە تەواو بەرۆکی خۆت لە شەیتان و شەیتان سیفەتەکان دادەڕنی.

١٨. خوێندنی فاتیحە بەو هەموو واتە زۆرەی کە لە خۆی گرتوە، لە خواناسی، بونناسی، مەنهەج ناسی، عبودیەت، بڕوا بون بە ڕۆژی دوایی، خوا لە خۆ ڕازیکردن، مەرجەکانی ڕێگای ڕاســت، دابەش بونی خەڵک بە پێی ڕێگای ڕاســت بۆ زانای پابەند، زانای ناپابەند، وە نەزان و گومڕا، وە ڕوونکردنەوەی کـاروانی ڕاســتـان کە خوای گەورە بـاسی کردون لە پێغەمبەران و راسـتان و شـەهیدان و ســاڵحان، وە لە فاتحە فێری نزا و پەرستن و پشت بەستن بە خوا دەبین، من وردەکاریەکانی مانای سورەتی فاتحەم لە تەفســیری فاتحەدا کردوە کە ئامادە کراوە ســوپاس بۆ خوا، بۆیە لێرە زۆری درێژی ناکەمەوە.

١٩. لە نوێژدا دڵ، ڕوح، بەدەن، بەشـداره بۆ ئەوەی نوێژەکە دروست بێ .

٢٠. لە نوێژدا قورئان خوێندن هەیە کە گەورەترین عیبادەتە .

٢١. لە نوێژدا چەمـانەوەو کرنۆش بردن هەیە کە دیســـان ئەمـانە لەحاڵەتە هەرە جوانەکانی بەندایەتین .

٢٢. لەنوێژدا سـەرت کە بەرزترین شـوێنە دەیخەیە سـەر نزمترین شـوێن کە زەویە، ئەمە ئەوپەری بەندایەتیە .

٢٣.  لە ســـوژدەدا دوعا و زیکری زۆر بخوێنرێ باشـــە چونکە مرۆڤی مسوڵمان زۆر لە خوا نزیکە (واسجد واقترب).

٢٤.  لە نوێژدا جۆرەها زیکر هەیە کە بە الله أكبر دەســـت پێ دەکەی، کەزۆر دوبارە دەبیتەوە، تەسبیحان، حمد کردن، سمع الله لمن حمده تا کۆتایی، لە نێوان ســـەجدەکان، قورئان خوێندن، تەحیات بە هەموو ئەدەب و ویقارە، ئەوجار بە پێوە وەستان، چەمانەوە، کڕنۆش، دانیشتن، ئەوجار لەتەحیات دا ئەو ڕێز نواندن و موناجاتە لە خزمەتی خوا، دوعا بۆ خۆت و بروادارن، ســـەلاوات لەســـەر ئیبراهیم موحەمەدو علیهما الصلاة والسلام و ئال و بەیتی ئەوان و هەموو برواداران.

٢٥.  نوێژ ڕزق و بەرەکەت و پێدرانی ماڵ و منالە، {فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا قَالَ يَـٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَـٰذَا قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ} (آل عمران: ٣٧)

واتە: ئینجا پەروەردگاری مەریەمی وەرگرت بەوەرگرتنێکی جوان وە ڕوواندی بە ڕوواندنێکی جوان وە زەکەریا دەســـتەبەریی کرد هەر کات

زەکەریا بڕۆشـــتبایە بۆ لای مەریەم لە شـــوێنی خواپەرســـتیەکەیدا خواردەمەنی لەلا دەبینی (زەکەریا) وتی: ئەی مەریەم ئەمەت لە کوێ بوو (مەریەم) وتی: ئەوە لەلایەن خواوەیە بەڕاسـتی خوا ڕۆزی دەدات بە هەر کەسێک کە بیەوێت بە بێ شومار.

دیارە گەورەترین خواپەرســـتی لە میحرابەکەیدا نوێژکردن بوە، وە دەبینی خوای گەورە چ منالێکی سالحی پێدا بە شێوەی موعجیزە.

٢٦. نوێژ گەورەترین ئارامی دەرونیە، چونکە نوێژ خوێنەکان زۆر بەئاسانی درکی پێ دەکەن، هەر لەوەشا دەردەکەوێ کە ناتوانن نەیکەن.

٢٧. نوێژ باشترین تەندروستی بۆ مرۆڤ دابین دەکا لە بواری، دەرونی، لاشەیی، بۆ دەماغ کە هۆکارە بۆ فراوان بونی خوێنبەرەکانی دەماغ مرۆڤ بەم کارە لە جەڵتەی مێشک دوردەکەویتەوە، وە هۆکارێکی باشە بۆ ئەوەی زۆرترین ئۆکسجین بگا بەدەماغ، بۆ ماسولکەو فەقەرات چونکە ئەم جوڵانە زۆر پێویستن بۆ جومگەو ماسولکەکان، ئەو پاک و خاوێنیەی کە لەدەست وێژدا هەیە، کە ڕۆژانە چەند جار ئاو بەکار دێنی کە لەهەموو شتێک زانستی ترە، چونکە پاکژکەرەوەکان (معقمات) لەبەر گەندەڵی بێ وێژدانی لە چاک و سودیان دڵنیا نین،

ئەوجار پێش هەموو شتێک دەست شوردن وە دڵنیا بون لەوەی تام و ڕەنگ و بۆنی نەگۆڕابێ چونکە هەر کام لەوانەی گۆڕابێ مانای وایە ئاوەکە تێک چوەو بەکەڵک نایە،

واتە شەریعەت زۆر بەئاسانی جیهازی دڵنیابونی پاک و تەندروستی ئاوی لەبەردەمی هەیەکێکمان داناوە، ئەوەکە پێویستی دەست نوێژ ئەوەیە ئاو لەلوتت وەربدەی هەم بە هەڵمسین هەم بە دەردان و فن کردنەوە، ئەوە وادەکا بەردەوام لوتمان خاوێن دەبێ و فایرۆزو بەکتریانی خراپی تێدا جێگا نابێتەوە، کەسێک شەو نوێژ بکا زۆر تەندروست دەژی یان لانی کەم کە نوێژی بەیانی لەکاتی خۆیدا بکا، چونکە خراپترین کاتەکان بۆ جەڵتە کۆتایی شەوو بەرەبەیانیانە، جگە لەوە ئەو هەموو میزوو پیسایەی کە لەلاشەت دایە کەلاشەت پێویستی پێ نەماوە دەبێ فرێ بدرێ تۆکە لەخەو دابی چۆن لێی ڕزگار دەبی!؟

وە ئەگەر بتەوێ شەو نوێژو نوێژی بەیانی بکەی دەبێ زوو بخەوی کە دیارە زوو خەوتن بناغەی تەندروستیە، ئەگەر بتەوێ هەلبستی دەبێ کەم بخۆی چونکە زۆر خواردن لاشە قورس دەکا، دیارە کەم خواردن دیسان نیشانەی تەندروستیە، واناێ زیاد لەپێویست ماندو بی ئەویش هۆکاریکە بۆ ئەوەی تەندروست بی، لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە کەتوشی

گوناه نابی کەهەمووگوناهەکان گاریگەری خراپی تەندروســـتیان هەیە، یەکێک لەوانەیە بڵێ چۆن؟ ئەگەر نوێژ خوێنی بەراســـتیی نابێ داوێن پیس، تریاک خۆر، شـــەراب خۆر، جگەرە کیش و نێرگەلە کێش بی، ئایا کام لەوانە بۆ تەندروســـتی باشـــن، ئەوانە چەند نمونەیەکی کەمن بەڵام دەردو نەخۆشی بۆ مرۆڤ دێنن.

٢٨. لەفەلســـەفەی نوێژ ئەوەیە بواری کۆمەڵایەتیمان بە هێزدەبێ، چونکە لەڕێی نوێژو مزگەوت زۆر ترین پەیوەندیت بەکەســـە خێرخوازو باشەکانەوە دەبێ .

٢٩. لە ڕووی ئابوریەوە کۆمەڵگەی مســـوڵمانی نوێژخوێن وەک یەک لاشـــە وایە، بۆیە نابێ کەســـێک بەهەژاری و نەداری لە کۆمەڵگەی نوێژ خوێن بەراســـتی هە ژار بمێنێ، بۆیە دەبینین ملیۆنـان و ملیـاران دۆلار دەدرێ بەهەژاران، یان چارەســـەر دەکرێن، یان خانویان بۆ دەکردرێ، یان کەفالەی ژیان و خوێندن دەکرێن .

٣٠. لەڕوی ســـیاســـیەوە کۆمەڵگەی نوێژخوێن کۆمەڵگەیەکی ئازادو ســـەربەخۆیە، دەبێ لەگوناهان دور بێ ، گەورەترین تاوان خزمەتی ســـتەم کارە، یان بێدەنگیە لەبەرانبەر ستەم کار.

٣١. وە لەڕوی زانستیەوە مسولمان دەبێ ئەهلی زانست و پێش کەوتنبێ، چونکە خوای گەورە زانستی لەسەر پێویست کردوە، دەبێ لەهەر شوێنێک بێ دەستیبخات، وە خوای گەورە لەسەری پێویستیکردوە خۆیان ئامادە بکەن بەرامبەر بەدووژمن بەهەموو تواناو هێزێک، هەروەک مسولمانان لەسەرەتادا وابوون بەهیزترین و داناترین و بەرەوشترین بون، بونە پێشەنگ و پێشەوای مرۆڤایەتی.

## بەشی سێیەم

## حوکمی نوێژ

گومان لەوەدا نیە کە نوێژ واجبە، وە یەکێکە لەپایە کانی ئیسلام، واجب بونەکەی بەقورئان و سونەت و کۆ دەنگی زانایان ئیسپات بوە.

١. قورئان: قورئانی پیرۆز لەچەندین ئایەتدا بەچەندین شێوە تەئکید لەسەر واجب بونەکەی دەکاتەوە.

- خوای گەورە ئەمری بەنوێژ کردوە هەم بەصیغەی جمع وەک دەفەرموێ: {وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ} (البقرة: ٤٣) واتە: ، نوێژ بکەن و زەکات بدەن و لەگەڵ کڕنۆشبەران کڕنۆش ببەن.

- هەم بە مفرد بەصیغەی تاک: {ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ} (العنكبوت: ٤٥)

واتە: بیخوێنەرەوە ئەو قورئانەی کە سرووش کراوە بۆت، وە نوێژ بکە بێگومان نوێژ بەرگری (نوێژکەر) دەکات لە کاری ناشرین و ناپەسەند (خراپە) وە زیکرو یادی خوا گەورەترە (لە هەموو شتێك) خواش بەهەر کارێك کە دەیکەن دەزانێ.

- وە هەم بە کۆمەڵی ئافرەتان : {وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا} (الأحزاب: ٣٣)

واتە: وە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن (لەناو خەڵکی نا مەحرەم دا) وەکو خۆ دەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەکەم (پێش ئیسلام) نوێژ بکەن و زەکات

بدەن وە گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن بەڕاستی خوا دەیەوێ ئەی ئال و بەیتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لە ئێوە دووربخاتەوە و پاك و خاوێنتان بكاتەوە بە تەواوی.

- هەم بە صیغەی رابردوو: { ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ} (الحج: ٤١)

واتە: ئەوانەی ئەگەر دەســـەڵاتمان پێدان لە زەوی دا بەچاکی نوێژ بەجێ دێنن وە زەکات دەدەن و فەرمان دەدەن بەچاکە و بەرگری دەکەن لە خراپە و سەرئەنجامی هەموو کارەکان تەنها بەدەست خوایە.

- هەم بە صیغەی بەردەوام و داهاتو: {ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ} (البقرة: ٣)

واتە: ئەوانەی باوەڕ بە غەیب ئەهێنن و، نوێژ ئەکەن و، لەو ڕزقانەی پێمان داون ئەبەخشن.

- هەم بە شیوەی چاوگ (مصدر): {وَجَعَلْنَٰهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِمْ فِعْلَ ٱلْخَيْرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِ وَكَانُوا۟ لَنَا عَٰبِدِينَ} (الأنبياء: ٧٣)

واتە: وە ئەوانمان کرد بە پێشەوا بە فەرمانی ئێمە ڕێنموونی (خەڵکیان) دەکرد وە نیگامان کرد بۆیان ئەنجامدانی کاری چاك و نوێژکردن و زەکات دان وە ئەوان هەر بۆ ئێمە عیبادەتیان دەکرد.

- هەم بە شێوەی مەدح و مایەی سەرفرازی بون و هۆکاری چونە بەهەشت: {قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ (المؤمنون: ١) {ٱلَّذِينَ هُمْ فِى صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ} (المؤمنون: ٢)

واتە: ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخوا ترسن (گەردن کەچن بۆ خوا،

{وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ} (المؤمنون: ٩)

واتە: وە ئەوانەی کە بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان،

{ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ} (المؤمنون: ١١)

واتە: ئەوانەی کەدەبنە خاوەن فیردەوس (بەهەشـــت) ئەوان لە بەهەشتدا دەمێننەوە بە هەمیشەیی.

- وە یەکیکە لە هۆکارەکانی نەچونە بەهەشت و چونە دۆزەخ ئەگەر کەسێک ئەنجامی نەدا: {مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ} (المدثر: ٤٢)

واتە: هەر لە بەهەشـــتی یەکان وەڵام ئەداتەوە کە دیومانن و پێمان وتوون چی ئێوەی خستووەتە دۆزەخەوە.

{قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ } (المدثر: ٤٣)،

واتە: ئەوانیش وتیان: ئێمە لە نوێژکەران نەبووین.

- ئەگەر بەتەمبەڵیش بیکەی پیشەی مونافیق و دوو ڕووەکانە چ جای ئەگەر نەیکەی: {إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا} (النساء: ١٤٢)

واتە: بەڕاستی دووڕووەکان دەیانەوێت خوا بخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە هەرکاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی و سستی

هەڵدەســـتن ڕوپامایی بۆ خەڵکی ئەکەن وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت.

هەم ئەم شێوازانە لەسەر واجب بونی نوێژ گومان بۆ مرۆڤی مسوڵمان ناهێڵێتەوە، مەگەر کەســـێک دڵنەخۆش و بێدین و نەزان بێ، ئایا دین لەوانە وەردەگیرێ!؟

- ســـونەت: پێغەمبەر باسی ئەوەی کردوە نوێژ پایەی دینە: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُـولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّـلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ "}،رواه البخاری.

کەواتە دوای شـــایەتمان گرنگتر لە نوێژ نیە، وە نوێژ کۆڵەکەی دینە، وە لەهە موو دینەکاندا هەبوە.

- {عَنِ النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ قَالَ :" بُنِيَ الْإِسْـلَامُ عَلَى خَمْسٍ : عَلَى أَنْ يُعْبَدَ اللَّهُ، وَيُكْفَرَ بِمَا دُونَهُ، وَإِقَامِ الصَّـلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَحَجِّ الْبَيْتِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ}، لەدوای ئیمان بەخوا و یەکتاپەرستی و کوفر بەغەیری خوا، باسی نوێژ کراوە.

٣. یەک دەنگی زانـایـان: هیچ کەس لەزانـایـانی ئیســـلام خیلاف و ڕاجیاییان نەبوە لەســـەر واجب بونی نوێژ مەگەر بێ دین و دوژمن و دڵ

نەخۆش و نەزان بوبێ، ئەوانەش هیچیان لێ وەر نـاگیرێ و ئیعتبـاریـان نیە.

## بەڵگەی ئەوانەی نوێژ نەکەر بەکافر دەزانن

دیـاره ئەوانەی نوێژ نەکەر بە کـافر دەزانن کۆمەڵێـک بەڵگەیـان هێناوەتەوە لە قورئان و ســـونەت و قســـەی زانایان، بابزانین بەڵگەکان چین.

١. گومان لەوەدا نیە کە حوکمی نوێژ نەکەر ڕاجیایی لەســـەرە لەنێوان زانـایـان، بەشـــێکیـان بەکافری دەزان ئەوانیش جیـاوازن، ئـایـا ئەگەر یەکجاری نەیکا، یان جار جار نەیکات.

٢. بەڵگەی قورئانی پیرۆز لەسەر کافربونی نوێژنەکەر: {يَوۡمَ يُكۡشَفُ عَن سَاقٖ وَيُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ} (القلم: ٤٢)

{خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ }(القلم: ٤٣).

دەوترێ ئەوانە لەبەر ئەوەی لەدونیا سەجدەیان بۆ خوا نەبردوە بۆیە لەقیامەتدا ناتوانن ســەجدە بۆ خوا بەرن کەواتە کافرن. ڕاســتی ناکرێ، ئەم ئایەتە بکرێتە بەڵگەی کافر بون بۆ؟

لەبەر ئەوەی دەبێ ئێمە ئایەتەکان لەسیاقی خۆیاندا تەفسیر بکەین، ئەگەر تەماشا کەین پێش ئەم ئایەتە و دوای ئەم ئایەتە باسی هاوبەش پەرست و ئەو کەسانە دە کا کە بڕوایان بە قورئانی پیرۆز نیە، پێشتر دەفەرموێ : {أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ فَلْيَأْتُوا بِشُرَكَائِهِمْ إِنْ كَانُوا صَادِقِينَ} (القلم: ٤١)، واتە: ئەگەر هاوبەشانێکیان بۆ خوا قەرار داوە و سودی بۆیان هەیە با بیهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن، کەدیارە ئەو بتانە هیچ سودیان نیە و ناتوانن بەرگریان لێ بکەن.

یوم زەرف بۆ فليـأتوا وە منصـــوب بەو عـامله، وە دواتریش دەفەرموێ : {فذرني ومن يكذب بهذا الحديث} ئەوا( فا) یەکە لەســەر (ذرني) دانراوە مقـدرە لەســـەر پێش خۆی، واتە مـادام ئەوان غەیری خوایان پەرســـوە، و ملیان بۆ خوا کەچ نەکردوە بۆ منی لێ گەڕێ، وە هەروەها مەرج نیە ســـەجدە لێرەدا نوێژ بێ، بەڵکو بریتی یە لەمل کەچ کردن بۆ خوا کە ئەوان نەیان بوە، وەک خوای گەورە دەفەرموێ:

{وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُواْ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ} (البقرة: ٣٤)

کاتێ بە فریشتەکانمان وت: «سوجدە بەرن بۆ ئادەم». سوجدەیان برد جگە لە ئیبلیس کە گوێی نەدا و خۆی بەگەورەزانی و لە ڕەتکەرەوەکان بوو.

دیارە کە مەبەست لە سەجدە سەجدەی نوێژ نیە بەڵکو سەجدەی ڕێزو مل کەچیە بۆ فەرمانی خوا، بۆیە ناکرێ ئەم ئایەتە بکرێ بە بەڵگەی کافر کردنی نوێژ نەکر، چونکە نەسیاقەکە، نەمانای سەجدە، هاوکار نیە بۆ ئەو واتایە، خۆ ئەگەر مەبەست لەسەجدەش نوێژ بێ، ئەوە مانع نیە هاوبەش پەرستەکان لەسەر نوێژ سزا بدرێن هەروەک چۆن لەسەر نەبونی ئیمانەکەیان و هاوبەش پەرستیەکەیان سزا دەدرێن.

٣. {مَا سَلَكَكُمْ فِى سَقَرَ} (المدثر: ٤٢) {قَالُواْ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ}(المدثر: ٤٣) {وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلْخَآئِضِينَ (المدثر: ٤٥) {وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ} (المدثر: ٤٦)

لێرەدا مەبەسـت لەم ئایەتەیە کە دەفەرموێ : لم نک من المصـلین، ئەم ئایەتە بەبەڵگە ناشێ کە نوێژ نەکەری پێ کافر بکرێ، چونکە ئەگەر وابێ دەبێ لەسـەر نەبەخشـینیش هەر کافر بێ چونکە ئەویش هەر ئایەتی قورئـانە، بەڵام بەڕواڵەتی ئـایەتەکە دیـارە تـاوانی هەرە گەورەی ئەوان نەبونی ئیمان بە دینی ئیسلام، یان زیندو بونەوەو ڕۆژی دواى، وە لەسەر ئەوەی ئەوان لە باطڵ ڕۆچون، لەپێشـتر خوای گەورە ئەوانی بە (مجرم) ناو زەدکردوە، بەزۆریش لەقورئاندا مەبەست لە مجرم بێباوەڕە،

{كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَـــبَتْ رَهِينَةٌ}(المدثر: ٣٨) {إِلَّآ أَصْــحَـٰبَ ٱلْيَمِينِ}

(المدثر: ٣٩) واتە: مەگەر هاوەڵانی دەستی ڕاست، واتە چاکەکاران،

{فِي جَنَّٰتٍ يَتَسَآءَلُونَ (المدثر: ٤٠) {عَنِ ٱلْمُجْرِمِينَ}(المدثر: ٤١)

واتە: لە (حاڵی) تاوان باران، پرسیار دەکەن چ شتێک ئیوەی خستۆتە ئاگرەوە.

بەڵگەی ئەوەی کە مجرم بە کافر هـاتوە خودی قورئانە: {إِنَّ ٱلَّذِينَ

كَذَّبُواْ بِـَٔــــايَٰتِنَا وَٱسْتَكْبَرُواْ عَنْهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدْخُلُونَ

ٱلْجَنَّـةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلْجَمَـلُ فِى سَـــمِّ ٱلْخِيَـاطِ وَكَـذَٰلِـكَ نَجْزِى ٱلْمُجْرِمِينَ}

(الأعراف:٤٠)

واتە: بەڕاستی ئەوانەی بێ بڕوا بوون بە ئایەتەکانی ئێمە وە خۆیان بە گەورەو زل دادەنا لە بەرامبەریاندا ئەوانە دەرگاکانی ئاســـمانیان بۆ ناکرێنەوە و ناچنە بەهەشـــتەوە هەتا حوشـــتر نەچێت بە کونی دەرزی درومانداا بەو جۆرە تۆڵە لە تاوانباران دەسێنین.

مجرم لەم ئـایەتە پیرۆزەدا ئەوانەن، ئـایەتەکانی قورئـانیـان بەدرۆ زانیوەو بەرامبەر ئایەتەکان خۆیان بە زل نواندوە، وە هەروەها قورئان دەفەرموێ: {وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا مِّنَ ٱلْمُجْرِمِينَ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيًا وَنَصِيرًا} (الفرقان: ٣)

واتە: ئا بەو جۆرە (موحەممەد(صلى الله عليه وسلم) کە دژایەتی تۆ دەکرێ) دامان ناوە بۆ هەموو پێغەمبەرێك دوژمنێك لە تاوانباران، بەسە پەروەردگارت ڕێنموونی کەرو یارمەتی دەرتبێ.

کەواتە مجرمین دوژمنی پێغەمبەرانن ئایا دەکرێ دوژمنانی ئەوان مسوڵمان بن؟! وەهەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُواْ

كَانُواْ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَضۡحَكُونَ} (المطففين: ٢٩) واتە: بێگومان ئەوانەی کە بەدکار بوون پێ دەکەنین بەوانەی کە بڕوایان هێنا بوو.

{وَإِذَا مَرُّواْ بِهِمۡ يَتَغَامَزُونَ} (المطففين: ٣٠) واتە: کاتێک کە بەلایاندا بڕۆشتنایە چاویان لێ دادەگرتن.

{وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمُ ٱنقَلَبُواْ فَكِهِينَ }(المطففين: ٣١) واتە: وە کاتێکیش بگەڕانایەتەوە بۆ لای ماڵ و منداڵیان، بە پێکەنین و گاڵتەکردن(بە موسوڵمانان)ە وە دەگەڕانەوە.

لەدوای ئەم خراپەو سوکایەتیەی مجرمین بەئیماندارن دەفەرموێ:

{فَٱلۡيَوۡمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنَ ٱلۡكُفَّارِ يَضۡحَكُونَ}(المطففين: ٣٤)

واتە: ئەمڕۆ کە ڕۆژی دواییە ئەوانەی کە بڕوادار بوون بە بێ بڕواکان پێ دەکەنن. خوای گەورە بەکافری داناون کەواتە ناکرێ ئەم ئایەتانەی سورەتی المدثر بەڵگەی بەکافر دا نانی نوێژ نەکەر بن.

٤. {فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ} (التوبة: ١١)،

واتە: ئینجا ئەگەر پەشیمان بوونەوە و نوێژیان بەجێهێنا و زەکاتیان دا ئەوە براتانن لە ئاییندا وە ئێمە بەڵگەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ گەلێك کە دەیزانن.

ئـایەتەکە بۆ برایەتی ئەوانە سێ مەرجی دانـاون، یەکیـان تەوبە لە شرک، دووەم نوێژ خوێنـدن، ســێیەم زەکـاتـدان، کەواتە تـاوانی هەرە گەورەی ئەوان هـاوبەش پەرســـتیە هەتـا تەوبەی لێ نەکەن هـیچ چاکەیەکیان لێ وەرناگیرێ، ئەگەر نوێژو زەکاتیش بێ بە بەڵگەی ئەوەی ئەوان موشریک بون، ئایەتە کانی پێشـترن کە شـەش جار باسی بێباوەڕان دەکات، وە ئەگەر وابێ دەبێ لەسەر زەکات نەدانیش هەر کافر بن چونکە ئەویش لەهەمان ئایەتدا هاتوە و هیچ جیاوازی نیە، جیا کردنەوەی دوو شتی وەک یەک هیچ پاساو مەعنایەکی نیە.

٥. {مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُواْ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ}

(الروم:٣١) واتە: شوێن ئایین بکەون بە تۆبەکارانە بۆ لای خوا بگەڕێنەوە و لەو بترسن و بەچاکی نوێژەکانتان بکەن و لە هاوبەش ڕەوادەران مەبن.

ئایا دەکرێ بەم ئایەتە نوێژ نەکەر کافر بکرێ؟

نەخێر ناتوانین بیکەینە بەڵگەی کافر بون، چونکە وەک وتمان دەبێ ئایەتەکان لەسیاقی خۆیان ڕاڤە بکەین.

- یەکەم ئایەتەکە ئاگادارمان دەکاتەوە وەک خاوەن کتابەکان پارچە پارچە نەبین، چونکە ئەوەی پیشەی ئەوان بو وەک دەفەرموێ: {إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمْ وَكَانُواْ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ} (الأنعام: ١٥٩)،

واتە: بەڕاستی ئەوانەی ئاینەکەیان بەش بەش کرد و بوون بە چەند دەستە و تاقمێکەوە تۆ لە هیچ شتێکدا لە ئەوان نیت بێگومان کاری ئەوان تەنها بۆ لای خوا دەگەڕێتەوە پاشان خوا هەواڵیان پێ دەدا بەهەر کردەوەیەك کە کردویانە.

- دووەم ئایەتەکانی پێشتر باس لەوە دەکەن کە لەسەر دینی حەنیف بین،کەدینی فیترەتە، کەواتە ئایەتەکە پێمان دەفەرموێ بگەڕێینەوە بۆ ئەم دینە کە دینی فیترەتە، وە لە خوا بترسین، وە نوێژ بکەین، وە لە بێباوەران مەبن، موشریکین لەوانەی دینیان پارچە پارچە کرد، وە دەکرێ مسوڵمانیش توشی هە مان دەرد بێ و هەمان سزا بیگریتەوە، بەپێی ئایەتەکە ئەگەر تەقواشمان نەبێ هەر کافر دەبین، دەتوانین بڵێی

لە دیارترین سیفەتی کافران نوێژ نەکردنە، هەروەک چۆن زەکات نەدانە وەک خوای گەورە دەفەرموێ: {قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ} (فصلت: ٦) {ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ} (فصلت: ٧) واتە: ئەوانەی کە زەکات نادەن و باوەڕیشیان بە ڕۆژی دوایی نی یە. وەک دەفەرموێ {أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ}(الماعون: ١) {فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ} (الماعون: ٢) واتە: ئەوە کەسێکە کە پاڵ بە هەتیوەوە دەنێ.

{وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ } (الماعون: ٣) واتە: وە هانی خەڵک نادات بۆ خواردەمەنی دان بە هەژاران.

نمونەی ئەوامان زۆرە لەقورئانی پیرۆزدا.

٦. {فَخَلَفَ مِنۢ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُوا۟ ٱلشَّهَوَٰتِ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا} (مريم: ٥٩)

واتە: ئینجا لە پاش ئەوان کەســـانێك (لە نەوەکانیان) بوونە جێنشـــینیان کە نوێژیان دەفەوتاند و شـــوێن هەواو ئارەزوو کەوتن جا ئەوانە لە داهاتوودا تووشی (سزای) گومڕاییان دەبن.

ئەم ئایەتەیان کردوە بەبەڵگەی کافر بونی نوێژ نەکەر، بەڵام نابێتە بەڵگە بۆ؟

چونکە خوای گەورە نەیفەرموە کافربون بەڵام زەمی کردون لەسەر ئەم دوو ڕەفتارە ناشیرن و دزێوە، یەکیان بەزایا دانی نوێژە، دووەم شوێن شەهەوات و ئارەزوکەوتن، وە خوای گەورە هەڕەشەی دۆزەخی لێکردون، ئایا مەرجە ئەوەی چۆ دۆزەخ کافر بێ؟ بە پێی قورئان نەخێر، بەبەڵگەی ئەوەی کە خوا دەفەرموێ: {وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا}(النساء: ٩)،

واتە: وە هەر کەســێك ئیماندارێك بەدەس ئەنقەس بکوژێت ئەوە تۆڵەی ئەو کەسـە دۆزەخە بە هەمیشـەیی تیایدا ئەبێت و خوا خەشـمی لێگرتووە و نەفرینی لێ کردووە و سزایەکی گەورەی بۆ ئامادە کردووە.

بکوژ ئەگەر بۆ خۆی کافر نەبێ بەکوشتن کافر نابێ مەگەر پێغەمبەرێک بکوژێ، خوای گەورە دەفەرموێ: {وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُواْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ فَإِن فَآءَتْ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ} (الحجرات: ٩)

واتە: ئەگەر دوو کۆمەڵ لە ئیمانداران دژ بەیەکتر جەنگیان کرد ئەوە لە نێوانیاندا ئاشـــتەوایی بکەن، ئینجا ئەگەر کۆمەڵێکیان دەســـت درێژی کرد بۆ ســـەر کۆمەڵێکی تریان، ئەوە ئێوە (موســـوڵمانان) لەگەڵ ئەوەیان بجەنگن دەســـت درێژی دەکات، تا دەگەڕێتەوە بۆ فەرمانی خوا (ملکەچی فەرمانی دەبێ) ئینجا ئەگەر گەڕایەوە ئەوســـا لە نێوانیاندا ئاشـــتەوایی بکەن بە دادگەرانە و ڕاســـت و دادپەروەر بن (لە نێوانیاندا)، بێگومان خوا دادپەروەرانی خۆش دەوێ.

کەواتە ئەگەر بکوژیش بێ هەر برایە، وە هەم بەبەڵگەی ئەوەی ئەوەی کەسەی کۆچ ناکا خوای گەورە دەفەرمێ ئەمانە دۆزەخین وەک دەفەرموێ: {إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ

كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا} (النساء: ٩٧)،

واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا کە ستەمیان لە خۆیان دەکرد(بە کۆچ نەکردنیان) بە تەشەرەوە پێیان دەڵێن(دەربارەی ئایینەکەتان) لە چیدا بوون؟! دەڵێن ئێمە چەوساوە بووین لەسەر زەوی دا(پێیان) دەڵێن مەگەر زەویی خوا فراوان نەبوو ؟. تا کۆچتان بکردایە تیایدا جا ئەوانە شوێنیان دۆزەخە ئای چ پاشە ڕۆژێکی خراپە.

٧. دەگوترێ شەیتان بەیەک سەجدەکە بۆ خوای نەبرد کافر بو، ئەی ئەوەی کە هەر سەجدە نابا!؟ {وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ} (البقرة: ٣٤)

واتە: کاتێ بە فریشتەکانمان وت: «سوجدە بەرن بۆ ئادەم.» سوجدەیان برد، جگە لە ئیبلیس کە گوێی نەدا و خۆی بەگەورەزانی و لە ڕەتکەرەوەکان بوو .

نەفرین لێکرانی شـــەیتان لەســـەجدەکەدا دەرکەوت دەنا هۆکارەکە کافربون و خۆ بەزلگرن و ڕەتکردنەوەی فەرمانی و خواو دژایەتی دەربرینی بۆ خواو ئیمانـداران و ڕێبازەکەی بو، وە خۆ پێ چاکتر بونی لە ئـادەم، هەمو ئەوانەش لەقورئانی پیرۆزدا باس کراون

٨. دەوترێ مونافیف نوێژیش دەکات دەچیتە دۆزەخ ئەی ئەوەی هەر نوێژ نـاکا؟ کەواتە دەبێ حـاڵی خراپتر بێ، وەڵام ئەوەیە مونـافیـق لەبنچینەدا بڕوای نیە، نوێژەکەی بۆ خۆپـاراســتن و فریودان و پیلان گێڕانە، بەڵگەی ئەوەی کە مونافیقی ئیعتقادی ئیمانی نیە بەڵگەی زۆرو زەوەندی قورئانی پیرۆزە.

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مَنَعَهُمْ أَن تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَٰتُهُمْ إِلَّآ أَنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمْ كَٰرِهُونَ﴾ (التوبة: ٥٤)

واتە: وە هیچ شتێك بەرگری ئەوانەی نەکردووە کە گیرا بکرێت لێ یان بەخشراوەکانیان بێجگە لەوەی کە بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون بەخواو پێغەمبەرەکەی وە نایەن بۆ نوێژ بە تەمەڵی نەبێت وە(هیچێك) نابەخشن ئیللا پێیان ناخۆشە و ناچارن.

{إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ} (المنافقون: ١)

وەدەفەرموێ : {وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ }(التوبة: ٦٨) واتە:

خوا بەڵێنی داوە بە پیاوو ئافرەتە دووڕووەکان و بە بێ باوەڕانیش بە ئاگری دۆزەخ دەمێننەوە تیایدا بە هەمیشەیی بە ئاگری دۆزەخیان بەسە و خوا نەفرینی لێ کردوون و سزای هەمیشەییان بۆ هەیە.

وە دەفەرموێ: {وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُواْ وَهُمْ فَٰسِقُونَ}(التوبة:٨) واتە: وە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) تۆ نوێژ مەکە لەسەر هیچ کەس لەوانە کە مرد هەتا هەتایە وە ڕامەوەستە لەسەر گۆڕەکەی بێگومان ئەوانە بێ باوەڕ بوون بە خواو پێغەمبەرەکەی و مردن لە کاتێکدا ئەوانە بەردەوام سنوور شکێن بوون.

هەر بۆیە لەقورئانی پیرۆزدا ئایەتێکمان دەســت ناکەوێ بێ چەندو چون بڵێ نوێژ نەکەر کافرە، بۆیە دەبێ وریابین و زیاترو قوڵتر بە واتای ئایەتەکاندا بچینەوە، چونکە تاوانێکی گەورەیە خوای گەورە شـــتێکی نەفەرموبێ ومەبەست نەبوبێ بڵێین وای وتوەو ئەوە مەبەستی خوایە .

ئەوە مانای ئەوە نیە کەمن بۆچونەکەی تر بەگوناهو تاوان دەزانم، بەڵام تەکفیر کردن کارێکی مەترســیدارە نابێ هەر کەس ڕاســت بێتەوە خەڵک کافر بکات.

## حوكمی نوێژ نەكەر لەسونەت دا

لە كۆمەڵێک فەرمودەدا هاتوە ناوی لە نوێژ نەكردن ناوە بەكوفر، واتە ترک الصلاة بە كوفر دەزانێ ئەمانە گرنگترینی ئەو فەرمودانەن:

١. {عَنْ أَبِي سُفْيَانَ ، قَالَ : سَمِعْتُ جَابِرًا يَقُولُ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " إِنَّ بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكَ الصَّلَاةِ ". رواه مسلم.

٢. {حَدَّثَنَا أَبُو غَسَّانَ الْمِسْمَعِيُّ ، حَدَّثَنَا الضَّحَّاكُ بْنُ مَخْلَدٍ ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ ، قَالَ : أَخْبَرَنِي أَبُو الزُّبَيْرِ ، أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَقُولُ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " بَيْنَ الرَّجُلِ وَبَيْنَ الشِّرْكِ وَالْكُفْرِ ت قَالَ }

٣. {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمُ الصَّلَاةُ، فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ.حكم الحديث: صحيح رواەالترمذی}

٤. {عَنْ أُمِّ أَيْمَنَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " لَا تَتْرُكِ الصَّلَاةَ مُتَعَمِّدًا ؛ فَإِنَّهُ مَنْ تَرَكَ الصَّلَاةَ مُتَعَمِّدًا فَقَدْ بَرِئَتْ مِنْهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ."

حكم الحديث: إسناده ضعيف لانقطاعه رواه أحمد فى مسنده}

٥. {رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ، وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ، وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ}

٦. {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ ذَكَرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا فَقَالَ : " مَنْ حَافَظَ عَلَيْهَا كَانَتْ لَهُ نُورًا وَبُرْهَانًا وَنَجَاةً مِنَ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ لَمْ يُحَافِظْ عَلَيْهَا لَمْ تَكُنْ لَهُ نُورًا وَلَا نَجَاةً وَلَا بُرْهَانًا، وَكَانَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَعَ قَارُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَأُبَيِّ بْنِ خَلَفٍ .حكم الحديث: إسناده صحيح رواه الدارمى}.

٧. {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ : شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ ٧. ٧_مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ." }.

ئەمانە کۆمەڵێل فەرمودەن بە صەحیح وە  لاوازەوە، کە ئەوەیان لێ دەفامریتەوە کە نوێژ نەکەر کافرە، بابزانین ئەم فەرمودانە بەڵگەی ڕوونن لەسەر کافر بونی نوێژ نەکەر؟

ئێمە ناکرێ بۆ تێگیشتن لەم فەرمودانە و وێنەی ئەوانە فەرمودەکانی ترو قورئان لەبەر چاو نەگرین.

ئێمە ئینکاری ئەو فەرمودانە ناکەین وەبەشیکیان صحیحن، بەڵام با بزانن واتاکەیان چیە؟

١. جارێ ئێمە نابێ پەلە بکەین لە بە کافر دانانی خەڵک چونکە تاوانیکی گەلێک گەورەیە، وەک پێغەمبەرمان دەفەرموێ علیه الصلاة والسلام: {يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ قَالَ لِأَخِيهِ : يَا كَافِرُ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا "}.. رواه احمد. حكم الحديث: حديث صحيح.

٢. ئەو بنچینە جوانەی کە دەفەرموێ : من ثبت إسلامه بيقين لا يخرج منه إلا بيقين.

٣. وە زانایان وەک شەوکانی و ئیبن عبدالبر و غەزالی و زۆری تریش دەفەرمون بەلگەکانی بە کافر دانانی کەسێک دەبێ وەک ڕۆژ ڕوون بن.

٤. خوای گەورە کە باسی کوفر دەکا دەفەرموێ: {مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ} (النحل: ١٠٦) واتە: ئەو کەسەی بێباوەڕ بێ بە خوا لەپاشان باوەڕ هێنانی مەگەر کەسێك زۆری لێ کرا بێت و دڵیشی دامەزراو بێت بە باوەڕ، بەڵام کەسێ دڵی خۆش و شادمان بێت بە بێ باوەڕی ئەوە بەرخەشم و قینی خوا کەوتوون و سزای گەورەیان دەبێ.

کەواتە کوفر ئەوەیە لەدڵەوە کافر بێ و دڵی بە کوفر شاد بێ.

٥. خوای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا } (النساء: ٤٨)

واتە: بەڕاستی خوا خۆش نابێت گەر هاوبەشی بۆ دابنرێ، بێجگەلەوە خۆش ئەبێت لەهەر گوناهێکی تر بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت، وە هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێت ئەوە بێگومان گوناهێکی زۆر گەورەی هەڵبەستووە.

٦. وه پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: علیه الصـــلاة والســـلم" {خَمْسُ صَـــلَوَاتٍ كَتَبَهُنَّ اللَّهُ عَلَى الْعِبَادِ، فَمَنْ جَاءَ بِهِنَّ لَمْ يُضَـــيِّعْ مِنْهُنَّ شَـــيْئًا اسْـــتِخْفَافًا بِحَقِّهِنَّ كَانَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ أَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَمَنْ لَمْ يَأْتِ بِهِنَّ فَلَيْسَ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ عَهْدٌ ؛ إِنْ شَـــاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَـــاءَ أَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ ".رواه ابوداو، حكم الحديث: صحيح. } . دەی ئەگەر کەسێک کافر بێ ناکەوێتە ژێر ویســتی لێخۆشــبونی خوا چونکە خوای گەورە بریاری داوە کافرو موشریک بۆ ئاگرە، کەواتە بەم فەرودە صـــحیحە ڕوون دەبێتەوە مەبەست لە کوفر ئەو جۆرە نیە کە پێی لە دین دەردەچێ.

٧. وه بەشێک لەزانایان ئەم جۆرە فەرمودەیان بەوە ناو ناوە کە داهاتوو سەرەنجام کافر دەبێ، چونکە کەسێک واز لەنوێژ بێنی پێی ئاسایی بێ ئێمە لێی دڵنیا نابین، کە لەداهاتودا کافر نابێ هەروەک پێغەمبەری خوا فەرمویەتی : {أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " الْمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ ".رواه ابوداود.حكم الحديث: حسن صحيح } جا هەرکەس دەربارەی قورئان دەمەتەقەی کرد کافر بێ زۆر مەترسیدارە بۆیە مەبەست ئەوەیە سەر دەکێشێ بۆ کوفر هەر وەک خوای گەورە دەفەرموێ :

{وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ } (یوسف: ٣٦)

کەدیارە ئەمە بە ئیعتباری داهاتویە، دەنا ئەوەی دەگوشرێ عەرەق نیە ترێ یە.

٨. ئەوەی کە دەڵێ نوێژ ڕوکنی دینە، گەر ڕوکن نەمێنێ، واتە پایە نەما ســـەقف نـامێنێ، نـابێتە بەڵگە چونکە ئەگەر وابێ بۆ زەکات، و ڕۆژو، حەجیش، هەر ڕاســـتە چونکە ئەوانیش پایەی ئیســـلامن و لەهەمان فەرمودەدا هاتون جیا کردنەوەی هیچ پاساوێکی نیە.

٩. فەرمودەی وعموده الصـــلاة ناکرێ بکرێتە بەڵگەی بەکافر دانانی نوێژ نەکەر، لەبەر ئەوەی کە ئەگەر پـایە (عمود) نەمـا بینـا دەروخێ، چونکە فەرمودەکە لاوازە بەکۆکردنەوەی هەموو ڕێگاکانی دەگاتە پلەی (حســـن)، ناکرێ بەم جۆرە فەرمودانە خەڵک کافر بکرێ، من نامەوێ فەرمودەکە تخریج کەم چونکە بابەتەکەمان ئەوە نیە.

١٠. دەبێ بزانین بەکافر دانانی دەیباتە ریزی کافر، و موشریک، و مرتد، ئەوکات حوکمەکە قورس دەبێ :

- لە مەحکەمە کردن.
- کوشتن بەکافری.
- جیا کردنەوەی خێزانی.

- میرات ناباو میراتی لێ ناگیرێ.
- ناشۆرێ  و لەقەبرستانی مسولمانان نانێژرێ.
- نوێژی لەسەر ناکرێ.
- چونە لای خیزانی دروست نیە و زینایە.
- ماڵەکەی دەبێتە هی مالیەی مسوڵمانان.
- لەرەحمەتی خوا بێبەش دەبێ و ناچێتە بەهەشت.
- بۆ هەتا هەتایە لەدۆزەخدا دەبێ.
- دروست نیە دوعاشی بۆ بکەی.

جابۆیە با پەلە نەکەین لە حوکمێکی ئەوا گرنگ کە ئەوە مەســـیرو داهاتوی بێ.

١١. نوێژ لەگەڵ زەکات باســکراوە بۆ بەنوێژ کافر دەبێ بەلام بەزەکات کافر نابێ؟

زانایان دەفەمون ( ولیس شرطا کل من وقع فی الکفر وقع علیه إسم الکافر) ، شــەرت نیە کە یەکێک کەوتە ناو کوفر یەکســەر دروســت بێ ناوی لێ بنێ کافر.

١٢. زۆر کردەوە ناوی کوفری لێنراوە، و خاوەنە کەشی کافر نابێ وەک:

- کوشتنی مسوڵمان.
- حوکم نەکردن بەوەی کە خوا ناردویەتی.
- چونە لای کاهن و فاڵچی.
- چونە لای ئافرەت لەکۆمەوە و لە کاتی سوری مانگانە.
- کەسێ بەری بێ لەنەسەبی خۆی.

وەشـــتی تریش، کە واتە تەفســـیر کردنی فەرمودەکـان بەم ڕێگـا سەلامەتە ئەولاترە بەوەی کە خۆمان توشی ئەم حوکمە ترسناکە بکەین.

١٣. کۆمەڵێک فەرمودە هەیە پێچەوانەی ئەو حوکمە وەک:

- قِيلَ : يَا رَسُـولَ اللَّهِ، مَنْ أَسْـعَدُ النَّاسِ بِشَـفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لَا يَسْـأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِـكَ عَلَى الْحَدِيثِ، أَسْـعَدُ النَّاسِ بِشَـفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ أَوْ نَفْسِهِ ".رواه البخاری.
- "مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ ". واه ابو داود
- حکم الحديث: صحيح.
- مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ ".رواه احمد.

حكم الحديث: حديث صحيح، وهذا إسناد حسن.

- "مَنْ مَاتَ، وَهُوَ يَعْلَمُ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ ." رواه مسلم.
- "مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ، إِلَّا حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ ". قَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَلَا أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا ؟ قَالَ " إِذَنْ يَتَّكِلُوا ". وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا .رواه البخاري .
- " أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، لَا يَلْقَى اللَّهَ بِهِمَا عَبْدٌ غَيْرَ شَاكٍّ فِيهِمَا إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ ".رواه مسلم.
- مَنْ شَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، وَأَنَّ عِيسَى عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ وَكَلِمَتُهُ أَلْقَاهَا إِلَى مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِنْهُ، وَالْجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ - أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ عَلَى مَا كَانَ مِنَ الْعَمَلِ ". قَالَ الْوَلِيدُ : حَدَّثَنِي ابْنُ جَابِرٍ ، عَنْ عُمَيْرٍ ، عَنْ جُنَادَةَ . وَزَادَ : " مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةِ أَيَّهَا شَاءَ ".رواه البخاري .

١٤. ئەوجار فەرمودەی بیتاقە كە بەدرێژی هاتوە:: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّ اللَّهَ سَيُخَلِّصُ رَجُلًا مِنْ أُمَّتِي عَلَى رُءُوسِ الْخَلَائِقِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيَنْشُرُ عَلَيْهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ سِجِلًّا، كُلُّ سِجِلٍّ مِثْلُ مَدِّ الْبَصَرِ، ثُمَّ يَقُولُ : أَتُنْكِرُ مِنْ هَذَا شَيْئًا ؟ أَظَلَمَكَ كَتَبَتِي الْحَافِظُونَ ؟ فَيَقُولُ : لَا يَا رَبِّ. فَيَقُولُ : أَفَلَكَ عُذْرٌ ؟ فَيَقُولُ : لَا يَا رَبِّ. فَيَقُولُ : بَلَى،

إِنَّ لَكَ عِنْدَنَا حَسَنَةً، فَإِنَّهُ لَا ظُلْمَ عَلَيْكَ الْيَوْمَ. فَتَخْرُجُ بِطَاقَةٌ فِيهَا : أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. فَيَقُولُ : احْضُرْ وَزْنَكَ. فَيَقُولُ : يَا رَبِّ، مَا هَذِهِ الْبِطَاقَةُ مَعَ هَذِهِ السِّجِلَّاتِ ؟ فَقَالَ : إِنَّكَ لَا تُظْلَمُ. قَالَ : فَتُوضَعُ السِّجِلَّاتُ فِي كَفَّةٍ، وَالْبِطَاقَةُ فِي كَفَّةٍ، فَطَاشَتِ السِّجِلَّاتُ، وَثَقُلَتِ الْبِطَاقَةُ، فَلَا يَثْقُلُ مَعَ اسْمِ اللَّهِ شَيْءٌ ". هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ واه الترمذي. حكم الحديث: صحيح}.

١٥. فەرمودەی شـــەفاعەت کە ئەویش بەدرێژی هاتوە: {إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُـهُمْ إِلَى بَعْضٍ، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فَيَقُولُونَ لَهُ : اشْـفَعْ لِذُرِّيَّتِكَ، فَيَقُولُ : لَسْـتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِإِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّـلَامُ، فَإِنَّهُ خَلِيلُ اللَّهِ، فَيَأْتُونَ إِبْرَاهِيمَ، فَيَقُولُ : لَسْـتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُوسَى عَلَيْهِ السَّـلَامُ، فَإِنَّهُ كَلِيمُ اللَّهِ، فَيُؤْتَى مُوسَى، فَيَقُولُ : لَسْـتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِعِيسَى. عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَإِنَّهُ رُوحُ اللَّهِ وَكَلِمَتُهُ، فَيُؤْتَى عِيسَى، فَيَقُولُ : لَسْتُ لَهَا، وَلَكِنْ عَلَيْكُمْ بِمُحَمَّدٍ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَأُوتَى، فَأَقُولُ : أَنَا لَهَا، فَأَنْطَلِقُ، فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي، فَيُؤْذَنُ لِي، فَأَقُومُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَأَحْمَدُهُ بِمَحَامِدَ لَا أَقْدِرُ عَلَيْهِ الْآنَ، يُلْهِمُنِيهِ اللَّهُ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَـاجِدًا، فَيُقَالُ لِي : يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَـكَ، وَقُلْ يُسْـمَعْ لَكَ، وَسَـلْ تُعْطَهْ، وَاشْـفَعْ تُشَـفَّعْ. فَأَقُولُ : رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ : انْطَلِقْ، فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ

بُرَّةٍ ، أَوْ شَـــعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا، فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ، ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّي، فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَـــاجِدًا. فَيُقَالُ لِي : يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَقُولُ : أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ لِي : انْطَلِقْ، فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجْهُ مِنْهَا، فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ، ثُمَّ أَعُودُ إِلَى رَبِّي، فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَـــاجِدًا. فَيُقَالُ لِي : يَا مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَـــكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَهْ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ. فَأَقُولُ : يَا رَبِّ، أُمَّتِي أُمَّتِي. فَيُقَالُ لِي : انْطَلِقْ، فَمَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِنْ مِثْقَالِ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ، فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ، فَأَنْطَلِقُ، فَأَفْعَلُ ". هَذَا حَدِيثُ أَنَسٍ الَّذِي أَنْبَأَنَا بِهِ، فَخَرَجْنَا مِنْ عِنْدِهِ، فَلَمَّا كُنَّا بِظَهْرِ الْجَبَّانِ ، قُلْنَا : لَوْ مِلْنَا إِلَى الْحَسَـنِ، فَسَـلَّمْنَا عَلَيْهِ، وَهُوَ مُسْـتَخْفٍ فِي دَارِ أَبِي خَلِيفَةَ، قَالَ : فَدَخَلْنَا عَلَيْهِ، فَسَـلَّمْنَا عَلَيْهِ، فَقُلْنَا : يَا أَبَا سَـعِيدٍ، جِئْنَا مِنْ عِنْدِ أَخِيكَ أَبِي حَمْزَةَ، فَلَمْ نَسْـــمَعْ مِثْلَ حَدِيثٍ حَدَّثَنَاهُ فِي الشَّـــفَاعَةِ. قَالَ : هِيهِ ، فَحَدَّثْنَاهُ الْحَدِيثَ. فَقَالَ : هِيهِ. قُلْنَا : مَا زَادَنَا. قَالَ : قَدْ حَدَّثَنَا بِهِ مُنْذُ عِشْرِيـــنَ سَـنَةً، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ جَمِيعٌ ، وَلَقَدْ تَرَكَ شَـيْئًا، مَا أَدْرِي أَنَسِيَ الشَّـيْخُ أَوْ كَرِهَ أَنْ يُحَدِّثَكُمْ، فَتَتَّكِلُوا ؟ قُلْنَا هلَهُ : حَدِّثْنَا، فَضَحِكَ، وَقَالَ : خُلِقَ الْإِنْسَانُ مِنْ عَجَلٍ، مَا ذَكَرْتُ لَكُمْ هَذَا، إِلَّا وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أُحَدِّثَكُمُوهُ : " ثُمَّ أَرْجِعُ إِلَى رَبِّي فِي الرَّابِعَةِ، فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ، ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا، فَيُقَالُ لِي : يَا

مُحَمَّدُ، ارْفَعْ رَأْسَكَ، وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وَسَلْ تُعْطَ، وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ، فَأَقُولُ : يَا رَبِّ، ائْذَنْ لِي فِيمَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. قَالَ : لَيْسَ ذَاكَ لَكَ - أَوْ قَالَ : لَيْسَ ذَاكَ إِلَيْكَ - وَلَكِنْ وَعِزَّتِي وَكِبْرِيَائِي وَعَظَمَتِي وَجِبْرِيَائِي، لَأُخْرِجَنَّ مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ ". قَالَ : فَأَشْهَدُ عَلَى الْحَسَنِ ، أَنَّهُ حَدَّثَنَا بِهِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ، أُرَاهُ قَالَ : قَبْلَ عِشْرِينَ سَنَةً، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ جَمِيعٌ. رواه مسلم }.

هەركەس بەئەندازەی كەمترین كیش و قورسایی ئیمانی هەبێ خوای گەورە لەدۆزەخ دەری دەكا، ئایا دەكرێ نوێژ كەمتر بێ لەبچوكترین بەشی ئیمان،!؟.

١٦. فەرمودەی تكاكردنی ئیمانداران بۆ براكانیان لە دۆزەخ: {عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ : " يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ، وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى : أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ. فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدِ اسْوَدُّوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهَرِ الْحَيَا أَوِ الْحَيَاةِ - شَكَّ مَالِكٌ - فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً ". قَالَ وُهَيْبٌ : حَدَّثَنَا عَمْرٌو الْحَيَاةِ، وَقَالَ : خَرْدَلٍ مِنْ خَيْرٍ. رواه مسلم}.

١٧. صحيح مسلم - كِتَابٌ : الْإِيمَانُ - بَابٌ : مَعْرِفَةُ طَرِيقِ الرُّؤْيَةِ

183، (٣٠٢). المجلد : 1 الصـــفحـة :١١٤)، ( ، حَتَّى إِذَا خَلَصَ الْمُؤْمِنُونَ مِنَ النَّارِ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ بِأَشَدَّ مُنَاشَدَةً لِلَّهِ فِي اسْـتِقْصَـاءِ الْحَقِّ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ لِلَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لِإِخْوَانِهِمُ الَّذِينَ فِي النَّارِ، يَقُولُونَ : رَبَّنَا، كَانُوا يَصُـــومُونَ مَعَنَا، وَيُصَـــلُّونَ، وَيَحُجُّونَ. فَيُقَالُ لَهُمْ : أَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ. فَتُحَرَّمُ صُـــوَرُهُمْ عَلَى النَّارِ، فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، قَدْ أَخَذَتِ النَّارُ إِلَى نِصْـفِ سَـاقَيْهِ، وَإِلَى رُكْبَتَيْهِ، ثُمَّ يَقُولُونَ : رَبَّنَا، مَا بَقِيَ فِيهَا أَحَدٌ مِمَّنْ أَمَرْتَنَا بِهِ. فَيَقُولُ : ارْجِعُوا، فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ : رَبَّنَا، لَمْ نَذَرْ فِيهَا أَحَدًا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا. ثُمَّ يَقُولُ : ارْجِعُوا، فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ نِصْـفِ دِينَارٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ : رَبَّنَا، لَمْ نَذَرْ فِيهَا مِمَّنْ أَمَرْتَنَا أَحَدًا. ثُمَّ يَقُولُ : ارْجِعُوا، فَمَنْ وَجَدْتُمْ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ فَأَخْرِجُوهُ. فَيُخْرِجُونَ خَلْقًا كَثِيرًا، ثُمَّ يَقُولُونَ : رَبَّنَا، لَمْ نَذَرْ فِيهَا خَيْرًا. - وَكَانَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ يَقُولُ : إِنْ لَمْ تُصَدِّقُونِي بِهَذَا الْحَدِيثِ، فَاقْرَءُوا إِنْ شِـــئْتُمْ { إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِنْ تَكُ حَسَـنَةً يُضَـاعِفْهَا وَيُؤْتِ مِنْ لَدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا } - فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ : شَـفَعَتِ الْمَلَائِكَةُ، وَشَـفَعَ النَّبِيُّونَ، وَشَـفَعَ الْمُؤْمِنُونَ، وَلَمْ يَبْقَ إِلَّا أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ. فَيَقْبِضُ قَبْضَةً مِنَ النَّارِ، فَيُخْرِجُ مِنْهَا قَوْمًا لَمْ يَعْمَلُوا خَيْرًا قَطُّ قَدْ عَادُوا حُمَمًا ، فَيُلْقِيهِمْ فِي نَهَرٍ فِي أَفْوَاهِ الْجَنَّةِ، يُقَالُ لَهُ : نَهَرُ الْحَيَاةِ،

فَيَخْرُجُونَ كَمَا تَخْرُجُ الْحِبَّةُ فِي حَمِيلِ السَّـــيْلِ ، أَلَا تَرَوْنَهَا تَكُونُ إِلَى الْحَجَرِ، أَوْ إِلَى الشَّجَرِ مَا يَكُونُ إِلَى الشَّمْسِ أُصَيْفِرُ وَأُخَيْضِرُ، وَمَا يَكُونُ مِنْهَا إِلَى الظِّلِّ يَكُونُ أَبْيَضَ ". فَقَالُوا : يَا رَسُـــولَ اللَّهِ، كَأَنَّكَ كُنْتَ تَرْعَى بِالْبَادِيَةِ. قَالَ : " فَيَخْرُجُونَ كَاللُّؤْلُؤِ فِي رِقَابِهِمُ الْخَوَاتِمُ يَعْرِفُهُمْ أَهْلُ الْجَنَّةِ، هَؤُلَاءِ عُتَقَاءُ اللَّهِ الَّذِينَ أَدْخَلَهُمُ اللَّهُ الْجَنَّةَ بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ، وَلَا خَيْرٍ قَدَّمُوهُ. ثُمَّ يَقُولُ : ادْخُلُوا الْجَنَّةَ، فَمَا رَأَيْتُمُوهُ فَهُوَ لَكُمْ. فَيَقُولُونَ : رَبَّنَا، أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ. فَيَقُولُ : لَكُمْ عِنْدِي أَفْضَـــلُ مِنْ هَذَا. فَيَقُولُونَ : يَا رَبَّنَا، أَيُّ شَيْءٍ أَفْضَـلُ مِنْ هَذَا ؟ فَيَقُولُ : رِضَـايَ، فَلَا أَسْـخَطُ عَلَيْكُمْ بَعْدَهُ أَبَدًا ". قَالَ مُسْـلِمٌ : قَرَأْتُ عَلَى عِيسَى بْنِ حَمَّادٍ زُغْبَةَ الْمِصْرِيِّ هَذَا الْحَدِيثَ فِي الشَّـــفَاعَةِ، وَقُلْتُ لَهُ : أُحَدِّثُ بِهَذَا الْحَدِيثِ عَنْكَ، أَنَّكَ سَـــمِعْتَ مِنَ اللَّيْثِ بْنِ سَـــعْدٍ، فَقَالَ : نَعَمْ، قُلْتُ لِعِيسَى بْنِ حَمَّادٍ : أَخْبَرَكُمُ اللَّيْثُ بْنُ سَـــعْدٍ ، عَنْ خَالِدِ بْنِ يَزِيدَ ، عَنْ سَـعِيدِ بْنِ أَبِي هِلَالٍ ، عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْـلَمَ ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَـارٍ ، عَنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ، أَنَّهُ قَالَ : قُلْنَا : يَا رَسُـولَ اللَّهِ، أَنَرَى رَبَّنَا ؟ قَالَ رَسُـولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " هَلْ تُضَارُّونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ إِذَا كَانَ يَوْمٌ صَـــحْوٌ ؟ ". قُلْنَا : لَا. وَسُـــقْتُ الْحَدِيثَ حَتَّى انْقَضَى آخِرُهُ، وَهُوَ نَحْوُ حَدِيثِ حَفْصِ بْنِ مَيْسَرَـــةَ، وَزَادَ بَعْدَ قَوْلِهِ : بِغَيْرِ عَمَلٍ عَمِلُوهُ، وَلَا قَدَمٍ قَدَّمُوهُ، فَيُقَالُ لَهُمْ : لَكُمْ مَا رَأَيْتُمْ وَمِثْلُهُ مَعَهُ، قَالَ أَبُو سَـــعِيدٍ : بَلَغَنِي أَنَّ

الْجِسْرَ–أَدَقُّ مِنَ الشَّعْرَةِ وَأَحَدُّ مِنَ السَّيْفِ، وَلَيْسَ فِي حَدِيثِ اللَّيْثِ، فَيَقُولُونَ : رَبَّنَا، أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنَ الْعَالَمِينَ، وَمَا بَعْدَهُ، فَأَقَرَّ بِهِ عِيسَى بْنُ حَمَّادٍ. رواه مسلم }

فەرمودەکە باس لەوە دەکا کە یەکەم جار ئەوانەی ئەوان بۆیان دەپارێنەوە نوێژ، و زەکات، و حەجیان هەیە، بەڵام جارەکانی تر ئەوانەیان نیە، بەبەڵگەی ئەوەی هەمان شت دووبارە نەبۆتەوە، واتە باسی حەج، و زەکات، و ڕۆژووە، بەبەڵگەی ئەوەی ئەوانە لە ئەندازەی گەردیلە گەورەترن.

١٨. فەرمودەکەی کە دەفەرموێ: گوتنی لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ سودی بۆیان دەبێ :

{عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ الْيَمَانِ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " يَدْرُسُ الْإِسْلَامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ، حَتَّى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ، وَلَا صَلَاةٌ، وَلَا نُسُكٌ، وَلَا صَدَقَةٌ، وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فِي لَيْلَةٍ، فَلَا يَبْقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ، وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنَ النَّاسِ ؛ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ وَالْعَجُوزُ يَقُولُونَ : أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَنَحْنُ نَقُولُهَا ". فَقَالَ لَهُ صِلَةُ : مَا تُغْنِي عَنْهُمْ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَهُمْ لَا يَدْرُونَ مَا صَلَاةٌ، وَلَا صِيَامٌ، وَلَا نُسُكٌ، وَلَا صَدَقَةٌ ؟ فَأَعْرَضَ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ رَدَّهَا

عَلَيْهِ ثَلَاثًا، كُلُّ ذَلِكَ يُعْرِضُ عَنْهُ حُذَيْفَةُ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَيْهِ فِي الثَّالِثَةِ، فَقَالَ : يَا صِلَةُ، تُنْجِيهِمْ مِنَ النَّارِ. ثَلَاثًا رواه إبن ماجه .حكم الحديث: صحيح}، لەوکاتەدا ئیســـلام نەماوە تەنها بەتەمەنەکان دەزانن بڵێن لاإله الا الله لەگەڵ ئەوەش سودی بۆیان هەیە.

١٩. وە خوای گەورە ستەم ناکاو بەئەندازەی گەردیلەیەک چاکە بەزایا نادا وەک دەفەرموێ: {إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ وَإِن تَكُ حَسَــنَةً يُضَـٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا} (النســاء: ٤٠) واتە: بەڕاســتی خوا قورسـایی گەردیلەیەك ستەم ناكات، وە ئەگەر چاكەیەك هەبێت(خودا) چەندانەی دەكاتەوە و دەیبەخشێت لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورە.

من مەزهەبم ئیرجائی نیە ناشـڵیم کردەوە پێویسـت ناکا، ناشـڵیم خاوەنی گوناهی گەورە ناچیتە دۆزەخ، بەڵام لێرەدا مەبەســـتم ئەوەیە خەڵک لەرەحمەتی خوا دەرنەکەین، چونکە خوای گەورە خەڵکانێک دەباتە بەهەشــت کە کردەوەی چاکیان نەکردوە، یان کردەوەیان هەر نیە، ئەی بۆ ئەوانە بخەینە دۆزەخ کە بڕوایان بە خواو بەدواڕۆژ هەیە، و رقیان لەکافرو وشـەی کوفره!: "{تَحَاجَّتِ الْجَنَّةُ، وَالنَّارُ، فَقَالَتِ النَّارُ : أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبِّرِينَ، وَالْمُتَجَبِّرِينَ. وَقَالَتِ الْجَنَّةُ : مَا لِي لَا يَدْخُلُنِي إِلَّا

ضُـــعَفَاءُ النَّاسِ وَسَــــقَطُهُمْ. قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنَّةِ : أَنْتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَـــاءُ مِنْ عِبَادِي. وَقَالَ لِلنَّارِ : إِنَّمَا أَنْتِ عَذَابِي أُعَذِّبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي، وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا، فَأَمَّا النَّارُ فَلَا تَمْتَلِئُ حَتَّى يَضَعَ رِجْلَهُ، فَتَقُولُ : قَطْ قَطْ. فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ، وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ، وَلَا يَظْلِمُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا، وَأَمَّا الْجَنَّةُ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا ".رواه البخارى}

من لەبەڵگەکانی سـونەت بەوەندە واز دینم لە بەشی چوارەم باسی ڕای زاناین دەکەم ان شاء اللە.

هەرکەسـیش قسـەی جیاوازی هەیە، یا هەڵەکانم بۆ راسـت دەکاتەوە سینگم فراوانەو سوپایشی دەکەم.

## بۆچونی زانایان لەسەر نوێژ نەکەر

گومان لەوەدا نیە کە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر نوێژ نەکەر، ئەم بابەتە لە چەند خاڵێکدا ڕون دەکەینەوە،

١. ئایا کۆدەنگی زانایان لە هەوەڵان و شـــوێن کەوتوان و غەیری ئەوان لەسەر بەکافر دانانی نوێژ نەکەر هەیە؟

بێگومـان نەخێر بۆ؟ چونکە لەســـەردەمی پێغەمبەرداو لە وجودی پێغەمبەردا( إجماع) ئیعتباری نیە، ئەگەر تەشریفیان هەبێ، وە ئەگەر موخالیفیش بن، کە قەت شـــتی وانا بێ هەر ئەرزشی نیە، وە لەزەمانی پێغەمبەردا بە وجودی جەنـابیـان هـاوەڵان پەرتەوازە بون وە قەت نەگونجاوە هەموو هاوەڵان لەهەموو دونیا هاتبنە مەدینەو کۆبونەوەیان کردبێ لەسەر حوکمێک و ڕێک کەوتبن، ئەگەر کەسێک شتێکی بینیوە با تەنیا یەک نمونەمان داتێ، کەدڵنیام نیە،

ئەوەی ئەوان پێی دەڵێن ئیجماع لەدوو حاڵ تێپەڕ ناکا، یان کۆدەنگی خەڵکی مەدینەیە، یـان کۆدەنگی بێ دەنگیە کە پێی دەڵێن (الاجمـاع

السـکوتی) کە ئیمامی شـافعی لە مێژە فەرمویەتی ( لا ینسـب إلی سـاکت قول).

٢. چۆن دەکرێ ئیجماع پێچەوانەی قورئان و ســـونەت بێ، کە ئێمە ئەو هەموو بەڵگەیەمان هێنایەوە.

٣. وە چۆن دەکرێ ئیجمـاع هەبێ، بەڵام چوار مەزهەبەکە و ئەو هەموو زانایانەی کە شـوێن کەوتوی ئەوانن پێیان نەزانییێ و پێچەوانەی جوڵابنەوە!؟.

٤. ئەدی چۆن دروســـتە موخـالەفەی کۆدەنگی هـاوەڵان و شـــوێن کەوتوان و زانایان بکرێ!؟.

٥. من دڵنیام بەپێی ئەم دوو پێناسەی کە زانایان بۆ ئیجماعیان کردوە، کە یەک دەنگی ئوممەت بێ، یان یەک دەنگی موجتەهیدی ئوممەت بێ، لەدوای وەفاتی پێغەمبەر لەسەر حوکمێکی شەرعی بەو مانایە ئیجماعێک لەسەر زەوی وجودی نیە.

٦. لە مرۆدا بەو هەموو ئامێرە پێشکەوتوەی کە هەیە ئیجماع دروست نابێ، جا چۆن لەو کاتەدا کۆدەنگی دروست بوە وە چۆن کۆ بونەوە!؟.

٧. ئەوەی پێی دەڵێن ئیجماع ئەوەیە بەدەق قەتعی ئیسپات بوە کەسیش بۆی نیە موخالەفەی دەق قەتعی بکا، وەک نوێژو، ڕۆژو، حەج و زەکات و حەرامی کوشتنی بەناحەق و زیناو ریباو هتد، ئەم دەقانەش ئەگەر هەوو ئومەت خلافی پێ کەنابێ، هیچ ئیعتبار بۆ موخالەفەکەی نیە، جا ئایا ئەم جۆرە لەکۆدەنگی هەیە لەسەر کافر بونی نوێژ نەکەر؟ من یەقینم هەیە کە نیە.

٨. خۆ ئەگەر حوکمی شەرعی بەدەقێکی قەتعی ئیسپات بێ گرنگترە تاوەکو بەئیجماع، چونکە دەق سەرچاوەی یەکەمە، بەڵام کۆدەنگی سەرچاوەی سێ یەمە ، ئایا کامەیان ئەولاترن؟.

٩. خودی مەزهەبەکان چ شافعیەکان، مالکیەکان، حەنەفیەکان، شیعەکان، ئیبازیەکان، نوێژ نەکەر بەکافر نازانن ئەگەر ئینکاری واجب بونەکەی نەکا، وەحەنبەلیەکان دوو بۆچونی روونیان هەیە یەکیان ئەوەیە کە بەکافری دەزانن ئەوی تر بەکافری نازانێ، ئەوەش کە بەکافری دەزانێ ئایا لەسەر ئەوە کافرە کە یەکجاری نەیکا، یان جار جار بیکا ،یان نەیکا ، ئەوەیان کە یەکجاری نەیکا لای ئەوان رای بەهێزە، وە هەر لەمەزهەبی حەنبلی حوکمی کافری بەسەردا دەدرێ، زانایانی حەنبەلی دەڵێن ئەوکاتەیە کە حاکم بانگی دەکاو داوای تەوبەی لێدەکرێ ئەگەر

تەوبەی نەکردو نوێژی نەکرد ئەوجار دەکوژرێ ئایا بەکافری واتە وەک مورتەد، یـان بەحەد لەبەر ئەوەی نوێژی نەکردوە؟ ئەوانە هەمووی پێویســـتە لەبەرچـاو بگیرێ، کەواتە تەنیـا یەک مەزهەب هەیە لەو مەزهەبانەی کە لە دونیادا باون بەکافری دەزانێ.

١٠. با پرســـیار لە خۆمان بکەین ئـایا تەکفیر بۆ دین و دونیـامان سـەلامەت ترە یان نا؟ گومان لەوەدا نیە کە بەکافر دانەنانی سـەلامەت ترە و دورترە لە گومان.

١١. ئایا سودی تەکفیر کردنی نوێژ نەکەر چیە؟

١٢. ئایا تەکفیر پێچەوانەی یەقین نیە کە زانایان دەفەرمون (من ثبت إسلامه بيقين لايخرج منه إلا بيقين)

١٣. پرسـیارێکی مەنتیقی کە زانایان لە دەمەتەقێکاندا گواسـتویانەتەوە باشــە نوێژ نەکەر دامان نا کافرە ئایا بەچی مســولْمان دەبێ؟ خۆ ئەگەر بلْێی بەنوێژ خۆ نوێژ لەکافر وەرناگیرێ، خۆ ئەگەر بلْێی بە شــایەتمان کە هەر ئەمەشـیان ڕاسـتە ئەو دەرکەوت کە نوێژ مەرجی ئیمان و مسـولْمان بون نیە، بەڵکو نیشانەی مسولْمان بونە.

١٤.   باشــه دامان نا هاوەڵان نوێژ نەکەریان بەکافر دانا، بە لام ئەوان لەبەر ئەوەی پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام ناوی ناوە کوفر، هەروەک چۆن ناوی لەتاوانی تریش ناوە کوفر، کەواتە ئەوان موافقی پێغەمبە بون لەســەر ئەم نــاوە بەڵام بە پـێی مـورادی پـێـغەمـبەری خـوا عـلـيه الصـلاةوالسـلام بە پێی بەڵگەکان کە باسـمان کرد مەبەسـت لە کوفری بچوکە.

١٥.   ئایا هاوەڵێک لە هاوەڵان وتویەتی کوفرێکە کە لەدینت دەردەکاو مسوڵمان نامێنی و کوفری گەورەیە ؟

١٦.  لەوانەیە بوترێ ئـاخر وشـــەی کوفر بەرەهـای کەبەکـار هـات مەبەســت لێی کوفری گەورەیە، ئەمە ڕاســتە ئەگەر بەڵگەو ڕێگرو مانع نەبێ بەڵام وەک ڕونمان کردوە هەموو ئەوانە هەن.

١٧.  ئەگەر بێینە سەر بواری کردەیی لەهەموو جیهانی ئیسلامی بەردەوام خەڵک مردوەو نوێژ نەکەری تێدا بوەو نوێژی لەســـەر کراوە، بۆ یەک جـاریش نەبوە و تۆمـار نەکراوە کەســێـک لە بەر نوێژ نەکردن نوێژی لەسەر نەکرابێ، نەشۆرابێ، لەقەبرستانی مسوڵمانان نەنێژرابێ، میراتی لێ نەگیرابێ، میراتی نەگرتبێ، لە خێزانی جیـا کـرابێتەوە بە قەزاوە یـان دادوەریەوە. ئەمانە ئیجماعێکی کردەییە.

١٨. ئەو فەرمودانەی کە موژدە بەخشن بە لێخۆش بونی خوا بۆ ئەهلی تەوحیـد، زۆر زیـاترە لەوانەی کەهەڕەشـــە دەکەن بە سزادانی ئەهلی تەوحید.

١٩. ئەگەر تەماشـــای قورئانی پیرۆز بکەین هەرەشـــەی سزاو ئاگر بۆ بروادااران زۆر بەکەمی دەســـت دەکەوێ، بەلام هەیە، بەلام بەزۆری هەرەشەی سزاو ئازارو دۆزەخ بۆ کافرانە.

٢٠. خوای گەورە عەفوو لێبوردنی پێش تۆڵە کەوتۆتەوە ئەوانە مادام بروادارن رۆژێـک لەڕۆژان رەحم و عەفوی خوا دەیـانگرێتەوە، چونکە خوای میهرەبان کەمتر لە گەردیلەیەک بەزایا نادا.

٢١. لەپاشان بەراستی بریار لەسەر کافر کردنی خەڵک مەحکەمەو قازی دەوێ، بەلام مســـوڵمـان بونی خەڵـک هیچ قەزاوەت و شـــاهیـدو مەحکەمەی ناوێ.

٢٢. تەکفیر دەبێ زانایان قسەی لەسەر بکەن نەوەک هەر کەس راست بۆوە لەسەر مینبەر خەڵک کافر بکا.

٢٣. مەزهەبی باوی وەڵاتی ئێمە شـــافعیە، ڕاســـتە مەزهەبی شـــافعی هەموو ئیســـلام نیە بەڵام مەزهەبە باوەکانی دونیا لەگەڵ کافرکردن نین بۆیە دەبێ رەچاوی بیرو باوەڕو مەزهەبی زۆرینەی خەڵک بکەین.

٢٤. باشە ئێمە کە ژنمان لەنوێژ نەکەر مارە نەکرد کاتێک کچێکی رازی کردوە، یان کچێک مەحروم بکەی لەمارەکردن چونکە نوێژ ناکا ئایا پەرچە کرداری ئەم کوڕو کچە چی دەبێ بەرامبەر بە ئیســـلام و مەلا ؟ کەواتە پێی دەڵێین تۆ دەبێ زینا بکەی چونکە ژنت لێ مارەناکرێ ، جا بۆ ناچی لەکاتی مارەکردندا ئامۆژگاریەکی باشی دلسۆزانەیان بکەی بۆ ئەوەی کە نوێژ بکەن، لەوانەیە بەقسەشت بکەن.

٢٥. مەڵێ ژنت لێ مارەناکەم، یان بەکچکەکە مەڵێ مارەت ناکەم لەو کورە، دەتوانی لەجیاتی ئەوە پرسیاریان لێ بکەی ئایا بڕوایان پێ یە یان نا، ئەگەر بروایان نەبو مارەی مەکە، وە ئەگەر بڕوایان پێ هەبوو ئامۆژگاریان بکەو لێی مارەبکەو توشی تاوانی زینای مەکە.

٢٦. ڕاســـتە لەوانەیە هەڕەشـــە بەکوفر هەندێک کەس بەرەو تەوبە بەرێ بەڵام بەکـافر دانـان پەرچە کرداری تونـدتری لێ دەکەوێتەوە، چونکە ئەو کەســـەی دەترسێ ئیمانی هەیە بۆیە دەترسێ بەڵام ئەوەی

ئیمانی لاوازە یان نەزانە دەڵێ باشـــە مادام من کافرم هەرچی خراپەیە دەیکەم.

٢٧. ئەوانەی نوسیومە لەسەر ئەم بابەتە هیچی نوێم بۆ بابەتەکە زیاد نەکردوە تەنیا بۆچونی زانایانم باس کردوە، وە خۆشـــم بڕوای تەواوم بەباتەکەیە بۆیە باسم کردوە، ئەگەر هەڵەمان کردوە لێی پەشیمانم، وە ئەوەش هەڵەمان بۆ راســت دەکاتەوە بەبەڵگەی قەناعەت پێهێنەر زۆر سوپاسی دەکەم و بەگوێی دەکەم. واللە أعلم بالصواب.

# بەشی چوارەم

## گەردن کەچی (خشوع) لەنوێژدا

نوێژ لە گرنگترین پایەکانی ئیسلامە، پێگەیەکی تایبەتی هەیە، لەهەموو دینە ئاسـمانیەکاندا هەبوە، وە زۆرخاوەنی کاریگەریە لەژیانی مرۆڤی مسـوڵماندا، وە هیچ بیانویەک نیە بۆ چواندنی، لە نەخۆشی، سـەفەر، سـەرقاڵی لە بیر چونەوە، خەوتن، هەرکات دەرفەت هەبو دەبێ بیکەی بە شـێوازی خۆی، بەڵام ئایا هەموو جۆرە نوێژێک دەتوانێ کاریگەر بێ و مرۆڤ پەروەردەکاو لە گوناهی گەورەو بچوک، ئاشـکراو نەهێنی دوری خـاتەوە؟ بێگومـان نەخێر، دەبێ ئەو نوێژە بێ کە خوای گەورە بـاسی کردوەو پێغەمبەری ئازیز ئەنجامی داوە علیه الصـلاة والسـلام، هەر چەند ناتوانین دەقیق بەو شێوە ئەنجامی بدەین بەڵام دەبێ هەوڵ دەین نزیکبینەوە لەنوێژی سـەروەرمان، (سـددوا وقاربوا) ئەگەر نەشـتوانین ئامانجەکە تەواو بپێکین دەبێ لێی نزیک بینەوە.

زانایان نوسـیـنی جوانیان کردوە لەسـەر گەردن کەچی لە نوێژدا وێنەی ئیمامی غەزالی لە( إحياء )دا وەزۆری تریش تایبەت لەسەر خشوع لەنوێژدا نوسینیان کردوە ئێمە دەتوانین سودیان لێوەرگرین، وە ئێمە بە پلەی یەکەم سـود لەقورئانی پیرۆز وەردەگرین، وە ئەوجار سـونەت، ئەوجار ئەو کتابانەی تایبەت بەبوارە نوسراون.

## گرنگی گەردن کەچی لەنوێژدا

١. ئەگەر تەنیا ئەو ئایەتە هەبێ لەسەر گەورەیی گەردن کەچی لە نوێژدا بەسە کە خوای گەورە دەفەرموێ: {قَدْ أَفْلَحَ ٱلْمُؤْمِنُونَ}(المؤمنون: ١).

واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن واتە سەر دەکەون.

{ ٱلَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَٰشِعُونَ} (المؤمنون: ٢)

واتە: ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخوا ترسن (گەردن کەچن) بۆ خوا.

٢. {لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ}(الحشر٢)

واتە: ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە بۆ سەر کێوێ (وە تێگەیشتنمان بدایەتێ) دەتبینی بە ملکەچی و لەت لەت بوو لە ترسی خوا ئەم جۆرە نموونانە دەیان هێنینەوە بۆ خەڵکی بۆ ئەوەی بیر

بکەنەوە. مل کەچی چیاکان لەبەرامبەر گەورەیی قورئان پارچە پارچە بونە ئەمە خشوعی ڕاستەقینەیە.

٣. خشوع بونی زەوی بەهۆی بێ بارانی وشک هەڵاتن و بچوک بونەوە و بێ ڕەنگ دەرکەوتنە، {وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَـٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ} (فصلت: ٣٩)

واتە: لە نیشانەکانی (دەسەڵاتی) خوایە کە زەوی دەبینی وشك و ماتە کەچی کاتێ بارانمان باراند بەسەریدا (بە ڕوانی ڕووەك) دەکەوێتە جوڵەو دەبوژێتەوە (بەرز دەبێتەوە) بێگومان ئەوەی (زەوی وشك) دەبوژێنێتەوە زیندوو کەرەوەی مردووەکانیشە بەڕاستی ئەو (خوا) بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

٤. وە بەپێچەوانەی ئایەتەکەی پێشو بەشێوەی نەرێنی ئەو ئایەتە بەسە کە دەفەرموێ: {فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ} (الماعون: ٤).

واتە: ئینجا وای بۆ نوێژ کەران.

{ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَـــلَاتِهِمْ سَـــاهُونَ} (الماعون: ٥) واتە: ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێ ئاگان.

نوێژ کەرێک نەزانێ بۆ نوێژ دەکا لەئامانجەکانی تێنەگا، پارێزگاری لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکی نەکا، وگەردن کەچ نەبێ، نوێژ نیە.

٥. نوێژی مونافیق بێ ڕوح و بۆ ڕوپامایيە وەک خوای گەورە دەفەرموێ: {إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا } (النساء: ١٤٢)

واتە: بەڕاستی دووڕووەکان دەیانەوێت خوا بخەڵەتێنن کەچی خوا خەڵەتێنەری ئەوانە هەرکاتێکیش هەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی و سستی هەڵدەستن ڕوپامایی بۆ خەڵکی ئەکەن وە یادی خوا ناکەن کەمێك نەبێت.

٦. کەسێ ئەهلی خشوع بێ زۆر بەئاسانی نوێژ ئەنجام دەداو لێی بەهرەمەند دەبێ { وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ} (البقر :٤٥)

٧. نوێژ ئامانجەکەی ئەوەیە بۆ خوا بێ و لە خزمەت خوادابێ { إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ}(طه: ١٤) واتە: نوێژی ڕاستەقینە ئەوەیە بمان گەیەنێتە زیکری خوا، ژیان بۆ خوا، ژیان لەگەڵ خوا سبحانە وتعالی.

٨. خوای گەورە وسفی پێغەمبەران دەکا بە خشوع، ترسان لە خوای، بەهیوا بونیان لە نزاکانیاندا، {فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ }(الأنبياء: ٩٠)

واتە: ئێمەش دوعای ئەومان وەڵام دایەوە و یەحیامان پێ بەخشی و خێزانەکەشیمان بۆ چاك کردەوە (لە نەزۆکی) بێگومان ئەوانە (ی باسکران لە پێغەمبەران) پێشبڕکێیان دەکرد لە (ئەنجامدانی) هەموو خێرو چاکەیەکدا و هاواریان لە ئێمە دەکرد بە ئومێدی (بەهەشت) و لە ترسی (دۆزەخ) وە ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئێمە (دەترسن) لێمان.

٩. دایکمان عائشە ڕەزای خوای لێبێ دەیفەرمو پێغەمبەری خوای علیه الصلاة والسلام قسەی لەگەڵمان دەکرد، وە ئێمەش قسەمان لەگەڵ

دەکرد، بەڵام ئەگەر نوێژ دەبو وەک ئەوە وابو نەمـان نـاســـیبێ و نەیناسیبین، کەواتە پێغەمبەری خوا زۆر بە باشی خۆی بۆ ئامادە دەکرد.

١٠. {يا بِلَالُ، أَقِمِ الصَّلَاةَ أَرِحْنَا بِها "}حكم الحديث: صحيح ،رواه أبو داود ، کەوتە پێغەمبەری خوا بە نوێژ دەحەسایەوە و ئۆقرەی دەگرت.

١٢. نـوێـژ ڕوونـاکی چـاوی پـێـغەمـبەری خـوا بـوە عـلـيه الصـــلاة والسلام،{وَجُعِلَ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ} رواه النسائی.

١٣. شـــەو نوێژ توێشـــویە بۆ نارەحەتی و زەحمەتیەکانی ڕۆژ کە مرۆڤی داعی توشی دەبێ : {إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔـــا وَأَقْوَمُ قِيلًا} (المزمل: ٦).

١٤. بەڕاسـتی هەسـتانی شـەو دوای خەو (بۆ خوا پەرسـتی) قورسـترە و گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لە هی ڕۆژ بەهێزترە بۆ دڵ) دروسترە لە ڕووی وتنەوە. { إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا }(المزمل: ٧)

واتە: بەڕاســـتی تۆ لە ڕۆژدا لە هاتوو چۆکردنێکی زۆردایت. توشی ئەزیەت و ئازاری زۆر دەبی بۆیە پێویستت بەتوێشوی شەو نوێژە.

١٥. خوای گەورە گلەیی دەکا لەبڕواداران کاتێک بەرامبەر قورئان گەردن کەچ نابن و کاریان تێ ناکا، {أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ (الحديد: ١٦)

واتە: ئایا وەختی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان ملکەچی بێ بۆ ئامۆژگاری خوا و ئەو قورئانەی کە ناردویەتیە خوارەوە؟ وەك ئەو کەسانە (جوولەکەو گاوور) مەبن کە لەمەوپێش کتێبی ئاسمانیان پێدرا وە ماوەیەکی دووروو درێژیان بەسەردا تێپەڕی ئینجا دڵیان ڕەق بوو وە زۆربەیان یاخی و لە سنوور دەرچوون.

١٦. لەقیامەت دا خشوع و مل کەچی هەموو شتێ دادەکرێ هەتا دەنگەکانیش نامێنن،

{يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا} (طه: ١٠٨)

واتە: لەو ڕۆژەدا هەموو دەکەونە شـــوێن جارڕدەری (کۆکردنەوە) لارە جلّەوی ناکەن لە فەرمانی لە ترسی خوای میهرەبان هەموو دەنگەکان نزم دەبن چپەچپ نەبێ شتێك نابیستی.

١٧. پێغەمبەری خوا بەنوێژ خەمەکانی دەرەواندنەوە : {كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَـــلَّى}، رواه أ بو داود حكم الحديث: حسن. گومان لەوەدا نیە نوێژێکی سادەو بێ ڕوح ناتوانێ ئەو کاریگەریانەی هەبێ، بۆیە دەکرێ ئەم بەڵگانە بکرێنە دەلیلی گەردن کەچی لە نوێژدا. ئەوەی باســمان کرد بۆ تێگەیشــتن بو لە واتاو پێگەی خشــوع و گەردن کەچی .

## هۆکارەکانی گەردن کەچ بوون لە نوێژ(أسباب الخشوع في الصلاة)

دەربارەی حوکمی خشوع لە نوێژدا زانایان ڕاجیایان هەیە بەشێکیان بەواجبی دەزانن، بەشـــێکیان بە ســـونەت، بەڵام بەڵگەکانی ئەوانەی بەپێویســـتی دەزانن بەهێزترو زیاترە، بەڵام دیارە گەردن کەچیش پلەی زۆری هەیە بەپێی کەس و ئاســـت و حاڵەتەکان دەگورێ، بەڵام ئەوەی گومانی لەســـەر نیە نوێژی تەواو ئەوەیە گەردن کەچی تێدابێ و مرۆڤی مســـوڵمان دور بخاتەوە لە تاوانی گەورەو بچوک، وە لە خوا نزیکمان خاتەوەو خۆشـەویسـتی و ترسی خوا لەدڵمان بڕوێنێ، ئەم بەرهەمانەش بەســـتراونەوە بە ئەنـدازەی گەردن کەچی لەنوێژدا بۆیە کەمێک بـاس لەهۆکارە کانی گەردن کەچ بون (الخشـــوع)دەکەین لە نوێژدا کە ئەمانەن بەکورتی و پوختی:

١. ناسینی خوا: گومان لەوەدا نیە هەرکەس بەئەندازەی ناسینی بۆ خوای گەورە، گەردن کەچی لە نوێژدا بۆ دروست دەبێ، کەسێ بزانێ خوا چەندە گەورەو بەهێزو میهرەبان و بەندە دۆستە حەتمەت خوای خۆش دەوێ و بۆی گەردن کەچ دەبێ، ئینسان بەندەی ئیحسانە جا کێ

ئەوەندەی خوا چاکەی لەگەڵ ئێمەدا زۆرە، لە دونیادا کەسێک چاکەی لەگەڵتدا هەبێ بەرامبەری خۆبەزلگری و لە خۆی بایی بون نانوێنێ، پێغەمبەران زاناترین کەس بون بە خوای گەورە بویە لەهەموو کەس زیاتر گەردن کەچ خوا بون، نمونە بۆ راستی ئەوقسەیە ئەوەیە کەپێغەمبەران سەلامی خوایان لەسەر بێ کەمترین هەڵەیان لەسەر تۆمار کراوە وە دەستبەجێ پەشیمان بونەوەو داوای لێبوردنیان لە خوا کردوە بۆ نمونە ئادەم سە لامی خوای لێبێ: {قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ} (الأعراف: ٢٣).

واتە: هەردووکیان وتیان ئەی پەروەردگارمان ئێمە ســـتەممان لە خۆمان کرد جا ئەگەر لێمان نەبوری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لەزیانباران دەبین.

بۆنمونە نوح: {قَالَ رَبِّ إِنِّىٓ أَعُوذُ بِكَ أَنْ أَسْـَٔلَكَ مَا لَيْسَ لِى بِهِۦ عِلْمٌ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ} (هود: ٤٧) نووح وتی: پەروەردگارم بەڕاستی من پەنات پێ دەگرم (لەوەی) داوای شتێکت لێ

بکەم کە نایزانم وە ئەگەر نەبوری لێم و ڕەحمم پێ نەکەی لە زیان لێکەوتوان دەبم.

بۆ نمونە داود : {قَالَ لَقَدْ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعْجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْخُلَطَآءِ لَيَبْغِى بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٌ مَّا هُمْ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ} (ص: ٢٤).

داوود وتی: سوێند بەخوا بەڕاستی ستەمی لێکردوی کە داوات لێ دەکات تاقە مەڕەکەت بخاتە ناو مەڕەکانی خۆی و بێگومان زۆر لەشەریك و هاوبەشان ستەم لەیەکتری دەکەن بێجگە لەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە، ئەوانەش زۆر کەمن، داوود زانی کە ئێمە تەنیا تاقیمان کردۆتەوە بۆیە داوای لێبوردنی کرد لە پەروەردگاری و کەوت بەڕوودا بە سوژدە بردنەوە و تۆبەی کرد.

بۆ نمونە یونس: {وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبًا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَىٰ فِى ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّى كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ } (الأنبياء: ٨٧).

واتە: وە(باسی) زەننون (یونس بکە کە پێغەمبەری خەڵکی نەینەوا بوو) کاتێ ڕۆشــت بە تورەیی (گەلەکەی بەجێ هێشــت) وای دەزانی ئێمە تەنگانەی بەســـەردا ناهێنین جا لە تاریکیەکاندا (تاریکی شـــەو و دەریا و ناوسکی نەهەنگ) هاواری کرد (ئەی خوا) بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە تۆ پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم.

موسا بۆ نمونە: { قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ} (القصص: ١٦).

وتی ئەی پەروەردگارم بەڕاســـتی من ســـتەمم لە خۆم کرد دەی لێم خۆشبە جا ئەویش (خودا) لێ ی خۆش بوو بێگومان تەنها ئەو لێبوردەی بە بەزەیی یە.

لەگەڵ ئەوەش ئەوان تەنیا ئەم هەڵە، یان کەمترینیان لەسەر تۆمار کراوە، بەڵام یەکسەر تەوبەیان کردوە چونکە خوای گەورەیان باش ناسیوە بۆیە زۆر بۆی گەردن کەچ بون.

٢. شارەزابون بەناو و سیفەتەکانی پەروەردگار: چونکە ئەو ناوانەی کەپەروەردگار بۆ خۆی بریاری داوە هەمویان سیفەت لە خۆیان دەگرن و هە مووشیان شوێنەواریان هەیە، بۆ نمونە الرحمن ناوی خوایە کەواتە خاوەنی سیفەتی رەحمەتە، وە شوێنەواری ئەو رەحمەتە بەهەموو شتێکەوە دیارە، وەک دەفەرموێ: .{ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ فَسَأَكْتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤْمِنُونَ} (الأعراف: ١٥٦).

٣. بینینی نیعمەتەکانی پەروەردگار: کە ئەوەندە زۆرن لە ژمارە نایەن وەک دەفەرموێ : {وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ} (النحل: ١٨).

واتە: وە ئەگەر (بتانەوێ) نیعمەتی خوا بژمێرن ناتوانن بیان ژمێرن بەڕاستی خوا لێبوردەی میهرەبانە.

{وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ} (إبراهيم: ٣٤).

واتە: وە لە هەموو ئەو شتانە کە داواتان کردووە پێ ی بەخشیوون، خۆ ئەگەر بەهرەو نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان ناژمێردرێن بەڕاستی ئادەمی (بێ بڕوا) زۆر ستەمکار و سپڵەیە.

{أَلَمْ تَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ} (لقمان: ٢٠).

واتە: ئایا نەتان زانیوە کە بەڕاستی خوا ڕامی هێناوە بۆتان ئەوەی لە ئاسمانەکان و ئەوەی لە زەوی دایە، وە نیعمەتەکانی بە فراوانی ڕشتووە بەسەرتاندا چ دیار و ئاشکرا و چ پەنهان و نادیارە، هەندێ لە ئادەمی موجادەلە و دەمەقاڵێ دەکات لەبارەی خواوە بەبێ هیچ زانیاریەك یا ڕێنموونی یەك یا کتێبێکی ڕوون کەرەوە.

وەدەفەرموێ: {وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْـَٔرُونَ }(النحل: ٥٣) .

واتە: وە هەر چاکە و بەهرەیەکتان هەبێ ئەوە هەمووی لە خواوەیە پاشان کاتێ دووچاری زیان و نارەحەتیەك ببن ئەوە پەناو هاوار هەر بۆ لای ئەو دەبەن.

مرۆڤ وا هەیە دەڵێ فلان کەس یەک چاکەی لەگەڵدا کردوم قەتم لە بیر ناچێ، قەد بێوەفا نابم بەرامبەری، ئەی خوای گەورەو میهرەبان، بۆیە کەسیک نیعمەتەکانی خوا بناسێ گەردنکەچ دەبێ.

٤. شـــوکری نیعمەتەکانی خوا: شـــوکری نیعمەت بەرهەمی ناســـینی نیعمەتە، وە هۆکاری زیاد بونی نیعمەتە، مەقامی شـــوکری حەقیقی کەم کەس پێی دەگا وە پەروەردگار بەردەوام دەفەرموێ: {قليلا ماتشـــكرون، وقليل من عبادى ا لشكور}.

وە دەش فەرموێ : {وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَـكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ } (إبراهيم: ٧).

واتە: بیریان بخەرەوە کاتێ کە پەوەردگارتان ڕای گەیاند ســـوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە ســـوپاسی (چاکەی) من بکەن بۆتان زیاد دەکەم بەڵام بێگومان ئەگەر نا ســـوپاسی بکەن ئەوە بەڕاســـتی سزای من زۆر بەتینە.

سولەیمان سەلامی خوای لێبێ کاتێک تەختی شاژنی سەبەئی لە چاو تروانێک بۆ گوازرایەوە ئەوپەری شوکری کرد: {قَالَ ٱلَّذِی عِندَهُۥ عِلۡمٌ مِّنَ ٱلۡكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِیكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن یَرۡتَدَّ إِلَیۡكَ طَرۡفُكَ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَـٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّی لِیَبۡلُوَنِیۤ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا یَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّی غَنِیࣱّ كَرِیمࣱ} (النمل: ٤٠).

واتە: ئەوەی زانســـتی لە کتێبی (ئاســـمانی) لابوو وتی من بۆت دێنم پێش ئەوەی چاوت بتروکێنی (تەختەکەی هێنا) جا کاتێك ســـولەیمان تـەختـەکـەی (بـەڵقیسی_) لای خۆیـدا بینی وتی ئـەمـە لـە فـەزلی پەروەردگارمەوەیە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ئایا شـــوکری (ئەم نیعمەتە) دەکەم یان پێ نەزان و ســپڵە دەبم، وە هەرکەسێ ســوپاسی خوا بکات ئەوە بێگومان ســـوپاس بۆ خۆی دەکات وە هەرکەســـیش ناســـوپاسی

بکات (زیانی بۆ خۆیەتی) چونکە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەندو بێ نیازە.

وە لە کاتێ لە زمانی مێروەکە تێگەیشت لە خۆشی ئەم نیعمەتە زەردەخەنە گرتی و پێکەنی و شوکری خوای کردو نزای کرد: {فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ} (النمل: ١٩ )

واتە: ئینجا (سولەیمان بەسەر سورمانەوە) زەردەخەنەی کرد لە قسەی ئەو مێرووله و وتی ئەی پەروەردگارم وام ڕابێنە کە سوپاسی ئەو چاکە و نیعمەتەکانت بکەم کە ڕشتووتە بەسەر من و دایك و باوکمدا وە (ڕام بێنە) کە کارو کردەوەی چاکە بکەم کە تۆ پێی ڕازی بێت وە بە بەزەیی خۆت بمخەرە ڕیزی بەندە چاکەکانت.

لە کاتێک دا زۆر کەمن ئەوانەی لەکاتی بونی ئەم نیعمەتە گەورانەدا خوایان لە یاد بێ بەڵکو قارونانە دەڵێن: {قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ

عِندِيٓ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ} (القصص: ٧٨).

قاروون وتی: بێگومان ئەم سامانەم پێ دراوە بەهۆی زانیارییەکەوە کە هەمە ئایا (قاروون) نەیزانیوە کەبەڕاستی خوا لەچەرخەکانی پێش ئەم دا لە ناوی بردووە کەسانی وا کە لەو (قاروون) بەهێزتر بوون کۆڕ و کۆمەڵیشیان لەو زۆرتر بووە (کاتێ سزای خوا هات) پرسیار ناکرێ لە تاوانەکانی ئەم تاوانبارانە.

٥. گرنگی دان بەدڵ: هەم بە پەروەردە کردنی، هەم بەئافاتەکانی بەتایبەت بە هۆی قورئان خوێندن، زیکر، فکر، شوکر، سەدەقە، خویندنەوەی کتابەکانی تایبەت بەپەروەردەی دڵ و ئافاتەکانی.

٦. دوور کەوتنەوە لە وەس وەسە بەهەموو جۆرەکانیەوە: چ سەبارەت بە بیرو باوەڕ، چ سەبارەت بەعیبادەت، چ سەبارەت بەهەڵس و کەوت.

٧. چاوەڕوانی کردنی نوێژ بە تامەزرۆییەوە.

٨. گرتنی دەستنوێژێکی پاک وەڵامدانەوەی بانگ بەتەواوی.

٩. ڕەچاو کردنی ئەدەبی ڕۆیشتن بۆ مزگەوت.

١٠. نوێژەکان بەجەماعەت بێ، بەتایبەت بۆ پیاوان.

١١. ئەنجام دانی بەجەماعەت.

١٢. أعوذ بالله کردن.

١٣. دوعای الاستفتاح.

١٤. جێ بەجێکردنی سونەتەکانی پێش و پاشی نوێژ.

١٥. گرنگی دان بەزیکرەکانی پەیوەند بە نوێژ لە ناوەو دەرەوەی نوێژ.

١٦. هەوڵ دەی بەدڵێکی ئامادە بچیە ناو نوێژ.

١٧. زۆر گرنگە بتوانی بیر لەوە بکەیەوە کە ئەمە لەوانەیە کۆتا نوێژی ژیانم بێ.

١٨. دڵت بە نوێژەکەت خۆشبێ و بێزار و تەمبەڵ خۆت نیشان مەدە.

١٩. نوێژ قسەکردنە لەگەڵ زاتی پەروەدگار.

٢٠. فریشـــتەکان زۆر بەچری چاوێریت دەکەن ئەوانە بەندەی گەردن کەچی پەروەدگارن.

٢١. خۆت لە دونیا بپچڕێنە.

٢٢. ئامێرە ئەلیکترۆنیەکان بێدەنگ کە.

٢٣. له شوێنێک نوێژ مه‌كه ته‌له‌فزیوۆن و مۆبایل و ژاوه ژاوی لێێ.

٢٤. بونی زیكر ی زۆر زۆر گرنگی هه‌یه بۆ گه‌ردن كه‌چی.

٢٥. قورئان خوێندنیی زۆر له‌ناو نوێژو ده‌ره‌وه‌ی نوێژ.

٢٦. هاورێیه‌تی ئه‌وانه‌ی نوێژیان جوانه.

٢٧. خوێندنه‌وه‌ی نوێژی پێغه‌مبه‌ر عليه الصلاة والسلام به‌وردی.

٢٨. خوێندنه‌وه‌ی نویژی هه‌وه‌ڵان و پیاچاكان.

٢٩. ئه‌و په‌رتوكانه‌ی تایبه‌ت به‌و بابه‌ته نوسراوه.

٣٠. ته‌ماشاكردنی كتابی (رهبان الليل) له‌ده‌ست مه‌ده ئه‌گه‌ر عه‌ره‌بی ده‌زانی.

٣١. سه‌ردانی قه‌برستان دڵ نه‌رم ده‌كا.

٣٢. سه‌ردانی ئه‌هلی ئیبتلا نه‌خۆش، نه‌خۆشخانه، لێقه‌وماو.

٣٣. بیركردنه‌وه له‌وانه‌ی ته‌مه‌ننا ده‌كه‌ن وه‌ک تۆ ساغ بان بۆ ئه‌وه‌ی به‌دڵی خۆیان له به‌رامبه‌ر په‌روه‌ردگار راوه‌ستابان ڕازو نیازیان كردبا.

٣٤. هه‌وڵده به‌نوێژ چاوت رون بێ، چونكه پێغه‌مبه‌ره‌كه‌مان عليه الصلاة والسلام ڕوناكی چاوی له‌نوێژدا بوه.

٣٥. بیرکەوە ئەگەر خوا نەکردە تۆی یەکێک بای لە نوێژ نەکەرەکان بۆیە سوپاسی خوا بکە لەسەر کردنی نوێژ.

٣٦. بیر لە سودو قازانجەکانی نوێژ بکەوە.

٣٧. بیر بکەوە نوێژ نەکەر چەند مەحرومە لەو هەمو خۆشـــیە ڕوحیە کەتۆ دەیبینی.

٣٨. بیر لەقورئان خوێندنەکەت بکەوە.

٣٩. بیر لە زیکرو دوعاکانت بکەوە.

٤٠. بزانە کە تۆ بەرامبەری خوای گەورە راوەســتاوی و ڕوی رەحمەتی لێتە.

٤١. نوێژ شـــنەی ڕەحمەتە خۆتی بدەرە بەر با لەو نەســـیمە بێ بەش نەبی.

٤٢. نوێژ کاتی نزاو پارانەوەی قوڵ و لەدڵەوەیە.

٤٣. نوێژ شوێنی گیرابونی دوعایە.

٤٤. بیر لە وشەکانی ناو نوێژ بکەوە.

٤٥. هەوڵدە لەشـــت گران نەبێ، بەهۆی ئەوەی کە نارەحەتی بۆســەر ئاو.

٤٦. پەلە لە نوێژدا مەکە، چونکە پەلە کردن نیشــانەی ئەوەیە لەزەتت لە نوێژ نەکردوە.

٤٧. بیربکەوە هیچ شتێک لە خوا گەورەتر نیە تا تۆ مەشغوڵ بکا.

٤٨. بیرکردنەوە لە مردن هیوای شەیتان دەبڕێ.

٤٩. بزانی خیرەکەت بەقەدەر کاریگەری نوێژەکەیە لەسەرت.

٥٠. دەنگـت بەرز کە بەقورئـان خوینـدن مـادام کەس بێزار نـاکەی بەتایبەت شەو نوێژ.

٥١. شەونوێژ بە دڵەوە لە کیس خۆت نەدەی چونکە شەونوێژ پیشەی ساڵحانە.

٥٢. بیر کردنەوە لەرەحمەتی فراوانی خوا.

٥٣. بیر کردنەوە لە مانای جوڵەکان بیر کەوە راوەســتان یەعنی چی، بە مـل کەچی، چەمـانەوە، کرنۆش، نێوان ســەجـدەکـان، دەســـت بەرزکردنەکان، تەحیات ، الله اکبری نوێژ دابەســتن، ســەلاوات لەســەر

پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، نزاکان، زیکرەکان، شیوازی دانیشتنت، سەلام دانەوە...

٥٤. قوڵ بونەوە لەفاتیحە و حیکمەت دوبارە بونەوەی.

٥٥. ئاوڕ نەدانەوەو خۆ سەرقاڵ نەکردن مەگەر پێویستیەک هەبێ.

٥٦. ئەم شتانە مەخۆ کە خەڵک و فریشتەکان بێزار دەکەن.

٥٧. بەهەیئەتێکی ڕێک و پێک نوێژ بکە.

٥٨. باشترین و خاوێنترین و بۆنخۆشترین لەبەر بکەو بەکار بێنە.

٥٩. یاری بەریش و سمێڵ و میزەرو ئەندامەکان مەکە.

٦٠. ئەگەر لە دەشتبوی سوترە بەکار بیتە.

٦١. لەشوێنی پیس نوێژ مەکە.

٦٢. بائافرەتت لەپێش نەبێ یان پیاو بۆ ئافرەتان نوێژ نابرێ بەس ئەجر کەم دەکا.

٦٣. لەپەنای دڕەندەو ئاژەڵی مەترسیدار نوێژ مەکە چونکە تام لەنوێژت ناکەی.

٦٤. لەمزگەوتدا بەس لەیەک شوین نوێژ مەکە.

٦٥. ئەگەر کرا لەماڵەوە باشوێنی تایبەتی نوێژن هەبێ و خاوین بێ.

٦٦. ئەگەر کرا بەرامبەری وێنە نوێژ مەکە باسەرنجت ڕا نەکێشێ.

٦٧. بەبێ هۆکار سەگ بەخیو مەکە.

٦٨. دەست بەسەری هەتیو دابینەو دڵخۆشی کە.

٦٩. بپاڕێوە خوای گورە خشوع ت بە نسیب بکا.

٧٠. داوا بکا لەچاکە کاران دوعای خشوع ت بۆ بکەن.

٧١. دوعای نوێژو گەردن کەچی بۆ خۆت و ماڵ و مناڵ و نەوەکانت بکە.

٧٢. بە پێی توانا لەنوێژی جەنازە بەشـداری بکە زۆر کاریگەرە بەتایبەت ئازیزان.

٧٣. دەنگی خۆت خۆش بکە لەقورئان خوێندن.

٧٤. هەریەک لەوانەی کە باسمان کرد کاریگەری خۆی هەیە، جا مەرج نیە لەیەک کاتدا بتوانی هەموو ئەوانە بەکار بێنی بەڵام دەتوانی سـودیان سودیان لێوەربگری.

٧٥. گوێ نەگرتن لە گۆرانی ومۆسیقا بەتایبەت ئەوەی کە ناشەرعیە.

٧٦. حه ج و عه مره کاریگەری باشـــیان هەیە، بە هۆی بینینی ئه و هەموو شـوینەوارو مەشـهەدە و زۆری زیکرو دوعایەی کە باباي زیارتکار دەیبینێ و دەیکات.

## بەشێک لە گەردن کەچی پێغەمبەری ئازیزمان لە نوێژدا

صـــلاة الخاشـــعين: ئەوانەی خشـــوع و گەردن کەچیان هەبوە لە نوێژەکانیاندا.

بێگومـان زۆرن ئەوانەی لە نوێژەکانیـانـدا گەردن کەچن بۆ خوای پەروەردگار، وەپێشتریش باسمان کرد ڕوحی نوێژ گەردن کەچیەوە ئەوەیە هەمیشـــە لەیادی خوادابین، وە دورکەوینەوە لەتاوانی گەورەو گچکەو دیارو نادیارو گوفتارو ڕەفتار، وە ژیانی پیاو چاکان بۆ ئێمە هانـدەرێکی باشـــە بۆ ئەوەی کارمان تێبکاو فێری گەردن کەچی بین، جا بۆیە ئەم بەشـــەم تایبەت کردوە بۆ ئەوانەی لە نوێژەکانیان گەردن کەچ بون لە ســـەروەرمانەوە علیه الصـــلاة والســـلام تا هاوەڵان و شـــوینکەوتوان و خەڵکانی هاوچەرخ.

١. نوێژی پێغەمبەری خوا علیه الصـــلاة والســـلام لەڕوی گەردن کەچیەوە: پێغەمبەری ئازیز کەســـێک بوە خوای گەورە بەرەحمەت بۆ جیهانیان ناردویەتی کەواتە میهرەبانیەکەی بەشی هەموو کەسی کردوە،

کەواتە ئەگەر دڵی پڕ ڕەحمەت بو بێ بۆ بەندەکان دەبێ دڵی بەرامبەری پەروەردگاری چۆن بوبێ !؟

پێغەمبەری خوا زۆر لە نوێژدا دەگریا ئە مەش نیشـانەی ئەوپەری گەردنکەچی بوە، هاوڵان هەستیان بەهەنسک و ناڵەی سینگی پێغەمبەر کردوە علیه ا لصلاة والسلام، عائشە دەفەرموێ ئەگەر کاتی نوێژ داهاتبا وەک ئەوەی کەنەمـان نـاسێ، وە دەیفەرمو ڕونـاکی چـاوم لەنوێژدا، وە دەیفەرمو بیلال دڵ خۆشـــمـان بکە بەبـانگـدان بۆ نوێژ، وە لەحەجی ماڵئاوایی و کاتی ســـەرە مەرگی دەیفەرموو (الصـــلاة الصـــلاة) ئاگاتان لەنوێژەکان بێ.

٢. بیلال ڕەزای خوای لێبێ نەریتی وابو بەیـانیـان پێغەمبەری خەبەر دەکردەوە علیه ا لصلاة والسلام، بەیانیەک بینی پێغەمبەر لەدوای شەو نوێژ دەگریـا، وتی ئەی پێغەمبەری خوا بۆ دەگری لە کـاتێکـدا خوای گەورە لە گوناهی سـەرەتاو کۆتایت خۆشـبوە، دەیفەرمو ئەی بیلال نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزار بم، ئەمشەو ئایەتێکم بۆ دابەزیوە. {إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ} (آل عمران: ١٩٠).

واتە: بەڕاسـتی لە دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوی دا و لە جیاوازی و گۆڕانی شـەوو ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیری یەکان. تا کۆتایی آل عمران هاوار بۆ ئەو کەسـەی دەیخوێنێتەوەو لێی ڕانامێنێ.

٣. هەمان شتیش لەگەڵ عائیشـەی خیزانی رویداوە کەپێی وتوە هێندە خۆت ئـازار مەدە خوای گەورە لە گونـاهەکـانـت خۆشـبوە، ئەویش فەرموی ئایا نابێ بەندەیەکی سوپاس گوزاربم؟

٤. عبد اللّٰەی کوری شـەخیر دەیوت هاتم بۆ خزمەتی پێغەمبەر علە الصلاة والسلام نوێژی دەکرد ناڵە لەسینگیەوە دەهات لەبەر گریان، جا بزانە دەبێ لە چ حـاڵەتێکی ڕوحی بەرزدابوبێ کەهـاواری لێ هـاتوەو دڵی کوڵیوە!؟. { عَنْ ثَابِتٍ ، عَنْ مُطَرِّفٍ ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ : انْتَهَيْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ يُصَلِّي، وَلِصَدْرِهِ أَزِيزٌ كَأَزِيزِ الْمِرْجَلِ. }رواه أحمد حكم الحديث: إسناده صحيح على شرط مسلم.

٥. پێغەمبەر هێندە لەنوێژدا دەمایەوە تاپێکانی دەئاوسـا کە پرسـیاریان لێکردبا بۆ وادەکەی؟ دەیفەرمو ئەی نابێ سـوپاس گوزار بم: { إِنْ كَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَيَقُومُ لِيُصَلِّيَ حَتَّى تَرِمُ قَدَمَاهُ أَوْ سَاقَاهُ، فَيُقَالُ لَهُ فَيَقُولُ : " أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا ". } رواه البخارى.

٦. عائشـە دەفەرموێ ڕەزای خوای لێبێ، پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والســـلام هێندە لەســـەجدە دەمایەوە وامدەزانی نەماوە بۆیە دەســـتم دەکردە قاچەکانی بزانم ماوە.

٧. جاری وابوە تابەیانی ئایەتێکی دووبارەکردۆتەوەو گریاوە وەک ئایەتی ، { إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ}

(المائدة: ١١٨).

واتە: ئەگەر سزایان بدەیت، ئەوە بێگومان بەندەی خۆتن وە ئەگەر لێشیان خۆش بی ئەوە بێگومان تەنها خۆتی بە دەستەڵاتی کاردروست.

٨. جـاری واهەبوە لەیەک ڕەکات دا ســـورەتی البقره، آل عمران، ال النســـاء، خویندوە ئەوە مانای ئەوەیە کە یەکجار لەزەتی لە نوێژ بینیوە چونکە جەنابیان قورئانی بەهیواشی خویندوە.

٩. جار وابوە هاوەڵان لە کاتی شەو نوێژدا لەخزمەتی ڕاوەستاون خەریک بوە بڕستیان ببڕێ لە دریژی نوێژەکانی .

١٠. خوای گەورە فەرمانی پێکردوە کە نوێژ بکا بۆ ئەوەی بگاتە مەقامی باڵا لەقیامەت دا کە هەمو دروست کراوەکان سوپاسی دەکەن: {وَمِنَ

ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا} (الإسراء: ٧٩) واتە: وە (ئەی موحەممەد(صلى الله عليه وسلم)) لەبەشێکی شەودا هەستە شەو نوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێدەوار بە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەند کراو.

١١. هەر وەسفێک لەقورئان دا هاتبێ دەربارەی شەو نوێژ، وە خشوع وگەردن کەچی، لە پێغەمبەردا هەبوە عليه الصلاة والسلام، (کان خلقه القرآن) وەک دایکمان عائشە دەفەرموێ رەزای خوای لێبێ.

١٢. هەرچی خشوع و گەردن کەچی و رێک راوەستان و گریان و هەنسک و قورئان خویندن، بەدەنگی خۆش و حەزین لە دڵی جەنابیاندا ئامادە بوە، بەهەزاران سەلات و سەلامی لەسەر بێ هەر کەسێ لەئومەتەکەی هەر چاکەیەک فێربوبێ و هەر پابەندیەکی بوبێ و گەردن کەچ بوبێ بۆ خوا هەموی لە دوای فەزڵ و رەحمەتی خوا، بەسەبەب رێنمای و بەرەکەتی پێغەمبەرە عليه أفضل الصلوات وأزكى التسليمات.

## گەردن کەچی هاوەڵان لەنوێژدا

هـاوەڵان لەپێغەمبەرەوە علیه الصــلاة والســلام  فێری دین و دینداری ببوون، بۆیە رەفتارەکانیان زۆر لەڕەفتاری ئەو دەچو، لە هەموو بوارێکـدا لە بوارەکـانی ژیـان بەگشــتی و خشــوع و گەردن کەچی لە نوێژەکانیاندا بەتایبەتی چونکە "هاوەڵان " خوای گەورە وەســفیان دەکا لەقـورئـانە پیرۆزە کەی خـۆی، بـگـرە لەتەورات و ئـینـجـیـل دا وەک دەفەرموێ :

{مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا سِيمَاهُمْ فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمَثَلُهُمْ فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا} (الفتح: ٢٩).

واتە: موحەممەد(صـــلی الله علیه وســـلم) پێغەمبەری خوایە، ئەو (باوەڕدار) انەش کە لەگەڵیدان بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین دەیان بینی (هەمیشـــە) لە کورنوش و ســـوژدە بردن دان، داوای بەهرەو ڕەزامەندی خودا دەکەن نیشـــانەیان لەناو چاوانیاندا دیارە، بەهۆی زۆر ســوژدە بردن (یانەوە)، ئەوە نموونەیانە لە تەوراتدا ئەوە نموونەشیان لە ئینجیلدا وەك کشتوکاڵێك وایە چەکەرەی دەرکردبێ (ســـەوز بووبێ) ئینجا چەکەرەکەی بەهێز کردبێ و قاییم بووبێ جا لەســـەر لاسکی خۆی ڕێك وەســتابێ (ئەوەندە جوان بێ) جوتیارەکانی ســـەرســـام کردبێ تا بە (زۆر بوونی) هەوەڵانی داخ و مەراق بدا بە کافران خوا بەڵێنی داوە بەوانەیان کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بە لێبوردن و پاداشتی گەورە (کە بەهەشت) ە.

کەواتە هاوەڵان لە پێش لە دایک بونیان بەســـەدان ســاڵی مەدحی کردون، وە لەنێوان ئەو ســـیفەتـا نەی کەئەوانی پێ وەســـف کراوە دەفەرموێ (تراهم رکعا سجدا)، واتە: بەرکوع و کرنۆش بردن وەسفیان دەکا، وەباسی ئەوە دەکا کە کڕنۆش و چەمانەوەیان کاری کردۆتەوە سەر سیمارو ڕەفتاریان ئەمە بەڵگەی ئەو پەڕی گەردن کەچیە، بۆ تێگەیشتن لە خشوع و گەردن کەچی هاوەڵان چەند نمونەیەک باس دەکەین:

1. ئەبوبەکر رەزای خوای لێبێ: کە پێغەمبەری خوا نەخۆش کەوت علیه الصلاة والسلام وتی بە ئەبوبکر بڵێن با پێش نوێژی بکا، عائشە، ئەبوبکر بە هۆی تۆوە خەمبارە وەدڵ نەرمە ناتوانێ لە جێگای تۆ نوێژ بکا. {مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ ". فَقِيلَ لَهُ : . . . إِنَّ أَبَا بَكْرٍ رَجُلٌ أَسِيفٌ ؛ إِذَا قَامَ فِي مَقَامِكَ لَمْ يَسْتَطِعْ أَنْ يُصَلِّيَ بِالنَّاسِ، وَأَعَادَ فَأَعَادُوا لَهُ، فَأَعَادَ الثَّالِثَةَ فَقَالَ:" إِنَّكُنَّ صَوَاحِبُ يُوسُفَ، مُرُوا أَبَا بَكْرٍ فَلْيُصَلِّ بِالنَّاسِ ". فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَصَلَّى فَوَجَدَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ نَفْسِهِ خِفَّةً، فَخَرَجَ يُهَادَى بَيْنَ رَجُلَيْنِ، كَأَنِّي أَنْظُرُ رِجْلَيْهِ تَخُطَّانِ مِنَ الْوَجَعِ، فَأَرَادَ أَبُو بَكْرٍ أَنْ يَتَأَخَّرَ، فَأَوْمَأَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنْ مَكَانَكَ، ثُمَّ أُتِيَ بِهِ حَتَّى جَلَسَ إِلَى جَنْبِهِ، قِيلَ لِلْأَعْمَشِ : وَكَانَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُصَلِّي وَأَبُو بَكْرٍ يُصَلِّي بِصَلَاتِهِ، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ أَبِي بَكْرٍ ؟ فَقَالَ بِرَأْسِهِ : نَعَمْ.} رَوَاهُ البخاری .

سور بونی پێغەمبەر تا سێ جار لەسەر ئەوەی ئەبوبکر نوێژ بکا مانای ئەوەیە:

- پێغەمبەری خوای لێ ڕازیە.

- وە لەهەموان بەتەقواترە ( واجعلنـا للمتقين إمـامـا)، ئەگەر ئەبوبکر بەتەقوا ترین نەبوایە بەئـامـادە بونی ئەو هەموو خەڵکە نەدەکرا بە ئیمام.
- پێغەمبەری خوا لە نوێژەکەی رازیبوە، چونکە نوێژ لە گرنگترین عیبادەتەکانە ئەگەر نوێژی ئەبوبکر لە وپەری تەواوی نەبایە ئەم ئەرکەی پێ نەدەسپارد.
- ئەبوبکر هەر بەتەبیعەت پیـاوێکی دڵ نەرم و بەبەزەیی بو، هەر بۆیە لەسـەرەتایی مسـوڵمان بونی شـەش کۆیلەی ڕزگارکرد، دەی دەبێ لەبەرامبەری خوا چەند دڵ نەرم و لە خوا ترس بوبێ.
- ئەبوبەکر یەکێـک لە موشریکەکـان داڵـدەی دابو، بەڵام ئەو قورئانی دەخوێند بەدەنگ، قورئان خوێندنەکەی ئەوەندە کاریگەر بو ئەم موشریکە لەبەر کـاریگەیەکەی پەنـادانەکەی ڕەتکردەوە، دەی دیارە قورئان خوێندن بەشێکە لە نوێژ.
- ئەبوبکر لەهەموو کەس زیـاتر بەپێغەمبەر کاریگەرتر بوە، دەی مانای ئەوەیە لە هەرکەس زیاتر نوێژەکانی بەپێغەمبەر چوە، هەتا زانـایان دەفەرمون هۆکاری وەفـاتی ئەبوبکر وەفـاتی پێغەمبەر بوە واتە تائەو ئەندازەیە کاریگەر بوە.

٢.    عومەر ڕەزای خوای لێبێ: موعاویەی کوری خەدیج لەکاتی ئیسراحەتی نیوەڕۆ چو بۆ سەردانی ئیمامی عومەر، وەیزانی قەیلولە دەکا، بەڵام بینی نوێژ دەکا، وتی ئەی موعاویە شتێکی خراپت گوت، یان گومانێکی خراپت برد، ئەگەر لەڕۆژ دا بخەوم ڕەعیەتەکەم بەزایا دەدەم، وەئەگەر لەشەوا بخەوم، ئەوە خۆم بەزایا دەدەم، کەواتە زۆربەی کاتی شەوانەی لە خزمەتی خوا پەرستیا بەسەر دەبرد.

_ جاریک سورەتی یوسفی دەخوێند لەڕیزی پشتوە گوێیان لە گریانی بوو.

٣.    عوسمانی کوری عەفان ڕەزای خوای لێبێ: خێزانەکەی دەیفەرمو عوسمانتان کوشت لەکاتێکدا شەوی هەموو زیندو دەکردەوە بەشەو نوێژ، هەتا دەوترێ لەشەوێکدا لەنوێژدا قورئانی خەتم دەکرد، هەتا ئەو کاتەش کە شەهیدیان کرد قورئان لەسەر کۆشی بو لەسەری هەڵنەستا زانیشی کە بۆی هاتونە ژوور بۆ ئەوەی شەهیدی کەن، بەلام ئەو بڕیاری دابو لەسەر ئەو بەدەستی ئەو لەشاری پێغەمبەردا خوێن نەرژێ.

٤.    عەلی ڕەزای خوای لێبێ: کاتێک زیراڕ پرسیاری لە موعاویەی کوری ئەبو سوفیان کرد ئایا عەلی چۆن بوە؟ ئەویش بەکۆمەڵێک وەسف وەسفی کرد لەوانە:

- عەلی سڵی لەدونیاو خۆشیەکانی دونیا دەکردەوە.
- زۆر بەشەو و تاریکی شەو دڵخۆش دەبو.
- ســوێند بە خوا دەخۆم هەندێک کات بینیومە کاتێک، شــەو چارشێوی دادەدایەوە، ئەستێرەکان ئاوا دەبون، دەچو شوێنی نوێژ خوێندنەکەی، وەکو نەخۆش لەترسی خوا ناڵەناڵی بو.
- وەکو خەمبار گریانی بو.
- وەک ئەوە وابو بڵێ ئەی دونیا دەتەوێ فریوم دەی و عەوداڵی منی، ئەوە دورە لەمن برۆ غەیری من فریو دە، من یەکجاری تەڵاقی تۆم داوە، ئەی دونیا تەمەنت زۆر کەمە هەم نشــینە کانت زۆر پەســت و کەمن، دواى دەیوت ئاە! ئاە! لەکەمی توێشــو، لەدوری ڕێگا.

موعاویە چاوەکانی پڕ بون لە گریان، وەخەڵکەکەش هەموو گریان، وە لەپاشان وتی ئافرەتان دەستەوستانن کەسێکی تری وەک عەلی بێننە دونیاوە، ئەمە شــاهێدی کەســێکی نەیاری ئیمامی عەلی یە دواى مردنی کەشاهێدی ئەم گەردنکەچی و شەو نوێژەی بۆ داوە.

٥. ئەبودەرداء ڕەزای خوای لێبێ: ســەلمانی فارسی لەگەڵ ئەبودەردا ببونە برا، بینی أم دەردا هیچ گرنگی بە خۆی نادەدا، وتی (یاأم درداء مالی

أراك متبذلة) ئەویش لەوەڵامدا وتی جا من خۆ بۆ کێ جوان کەم براکەت ئەبودەردا ڕۆژ بەڕۆژویە، و شـــەوان شـــەو نوێژ دەکا. هەرچەنـدە ئە مەکارێکی باش نیەو ســـەلمان ڕەخنەی لێگرت و ڕەفتارەکەی پێ گۆری و پغەمبەریش علیه الصلاة والسلام پشتیوانی بۆ چونەکەی سەلمانی کرد، مەبەست لێرەدا ئەوەیە هەندێک لە هاوەڵان ئەوەندە ڕۆچوبون لەشەو نوێژ، و لەززەت لە نوێژ، هەتا ماڵ و مناڵیان فەرامۆش کردبو.

٦. عەبدواللهەی کوری مەســـعود رەزای خوای لێبێ: ئەم پیاوە عادەتی وابوە کە دەبو بەشـــە و دەچۆ ناو نوێژەکانی، وەک مێشـــەهەنگ، دەنگی دەبیســـترا، وەدەیفەرمو پێویســـتە ئەوکەســـەی هەڵگرو خزمەت کاری قورئان بناسرێتەوە بەشـــەو بێدار، یان کاتێک کە خەڵک خەوتون، وە بە بەڕۆژوبونی ڕۆژ، یان کاتێک خەڵک ســـەرگەرمی خواردن و خواردنەوەن، وە بەخەمباری و خەمخۆریـان، کـاتێـک خەڵکی بێبـاکن و لەکەیف و ســـەیفەدان، وە بەگریـانیـان، لەکـاتێـک خەڵکان پێـدەکەنن، وە بەبێ دەنگیان، کاتێک خەڵک لەقسەو باسی بێهودەدان، وە بەگەردن کەچی و خشوعیان، کاتێک خەڵک خەریکی فیزو خۆ بەزل نواندن.

٧. ئەبو هورەیرە رەزای خوای لێبێ: خۆی و خێزانی و خزمەت کارێکیان هەبو شـــەویان دەکردە سێ بەش ، بۆئەوەی هیچ کام لەشـــەودا نەبێ کەتێیدا نوێژ بۆ خوا ئەنجام نەدرێ.

٨. ئەبو موسای ئەشعەری رەزای خوای لێبێ: دەنگی شـەو نوێژەکانی لە کۆڵان دەبیســـترا وەزۆریش دەنگی خۆش بوو، هەتا پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام خۆی گوێی لەدەنگە خۆشـەکەی دەگرت لەکاتی شـەو نوێژدا، دەیفەرموو نەغمەو ئاوازی ئالی داودتان پێدراوە، مەبەســتی ئەوە بو دەنگی زۆر خۆشـە: { نْ أَبِي مُوسَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ لَهُ : " يَا أَبَا مُوسَى، لَقَدْ أُوتِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ "}.رواه البخاري.

٩. عەبدواللەی کوری عومەر ڕەزای خوا لەخۆی و باوکی بێ: خەونێکی بۆ حەفسە گێرایەوە ئەویش بۆ پێغەمبەری گێرایەوە عليهلصلاة والسلام ئەویش فەرموی باشـــترین بەندە عبدالله یە ئەگەر بەردەوام شـــەو نوێژ بکا، لەدوای ئەم فەرمودەیە شـــەوانە کەمێک نەبا نەدەخەوت: {كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا فَأَقُصَّهَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ، وَكُنْتُ غُلَامًا شَـابًّا وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْـجِدِ عَلَى

عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَرَأَيْتُ فِي النَّوْمِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَيِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ، وَإِذَا فِيهَا أُنَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ فَجَعَلْتُ أَقُولُ : أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ. قَالَ : فَلَقِيَنَا مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي : لَمْ فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ : " نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ لَوْ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ". فَكَانَ بَعْدُ لَا يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلَّا قَلِيلًا.} رواه البخاري.

.١٠ تەمیمی داری ڕەزای خوای لێبێ: کەم کەس هەبو لەهاوەڵان بەقەدەر تەمیم شەو نوێژی کردبێ، جار وا هەبو لە خزمەت یەک ئایەتدا دەمـایەوە، مەبەســـت ئەوەیە نوێژی زۆر درێژ دەکردەوە، ڕەزای خوا لەهەمویان بێ خوای گەورە دەفەرموێ (تراهم رکعا ســـجدا) شـــایەتی خوای گەورە بۆ ئەوان بەســـە، هاوەڵان مەعســـوم نین لەتاوان بەڵام بەکۆی گشتی باشترینی مرۆڤایەتین.

## خشوع و گەردن کەچی شوێن کەوتوان (تابعین) لەنوێژدا

شـــوێن کەوتوان قوتابی و پەروەردەی هاوەڵە بەریزەکان بون، وە هەڵســـوکەوتی هـاوەڵان لەوانـدا زۆر جوان ڕەنگی داوەتەوە ڕەزای خوا لەهەموویان بێ، بۆیە بەچەنـد نمونەیەک لەوان وەربگرین بزانین چۆن بون لەکاتی نوێژکردندا.

١. وەیسی قەرەنی ڕەزای خوای لێبێ: {عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ، قَالَ : إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ : " إِنَّ خَيْرَ التَّابِعِينَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ : أُوَيْسٌ، وَلَهُ وَالِدَةٌ، وَكَانَ بِهِ بَيَاضٌ، فَمُرُوهُ فَلْيَسْتَغْفِرْ لَكُمْ "}. مسلم .

ئایا وەیسی قەرەنی بەچی گەیشتە ئەو پلەیەی کەوای لێبێ پێغەمبەر بە عمر بفەرموێ ئەگەر گەیشتی بەوەیس با داوای لێبوردنت بۆ لە خوای گەورە بکات، گومان لەوەدا نیە کە لە عیبادەتەکاندا لە لوتکە دابوە، بۆیە دەیوت ئەی خوای گەورە پەنا دەگرم لەچاوێ کە زۆر دەخەوێ و خەواویە، وە لە ورگێک کە تێر نابێ، جاری وابوە چاوەدیریان کردوە دوای

نوێژی عیشا تا بەیانی بەخەبەر بوە، وەبەیانی تا نیوە ڕۆ، وە تا عەسر، لەعەسر بۆ مەغرب، لە مەغریب بۆ عیشا نەبوە یان نوێژ نەکا یان زیکر نەکا، هەرچەندە ئەگەر ئەوە وەک کۆی دین تەماشا بکەین باش نیە چونکە مسوڵمان ئەرکی تری هەیە، بەڵام ئەوە هەڵویستی شەخسی خۆی بوە خۆیشی ئازادە چۆن ژیانی خۆی ڕای دەکا مادام نابیتە بار بەسەر کۆمەڵگاوە.

٢. سەعیدی کوری موسەیی گەورە تابعی خوای لێرازی بێ: دەوترێ دەیان ساڵ لە عیشاوە تابەیانی نەخەوتوە شەونوێژو مودارەسەی کردوەو چل ساڵ لەجەماعەت دوا نەکەوتوە.

٣. سالمی کوری عبداللە کوری عومەری کوری خەتاب رەزای خوا لە هە مویان بێ: موحەمەدی کوری ئەبی سارە دەڵێ، سالم هات بۆ حەج بینیم لە نزیک دەرگای بەنی سەهم دوای عیشا نوێژی دابەست تابەیان بەردەوام بو نەیپچری.

٤. ئەحنەفی کوری قەیسی گەورەی ئەهلی بەسرە رەزای خوای لێبێ : شەوانەی بەدوعاو نوێژ بەسەر دەبرد، وەچرایەکی لەپەنا خۆی دا نابو دەستی پێوە دەنا تا تینی بۆدەهات بەخۆی دەوت، ئەحنەف ئەو ڕۆژە بۆ وات کرد، ئەو ڕۆژە بۆ وات وت؟

٥. عەمری کوری مەیمونی ئەودی ڕەزای خوای لێبێ: ئەوەندە عابد بوە خەڵک ئەگەر ئەویان دیبا خوایان بیر دەکەوتەوە.

٦. مسروقی کوری ئەبی عبد الرحمن بەباوکی عائشە بەناو بانگ بو ڕەزای خوای لێبێ: ئەوەندە لەشەونوێژا دەمایەوەو دەگریا و دوعای دەکرد خیزانەکەی لەپشتیەوە بەزەیی پیدا دەهاتەوەو دەگریا، خیزانەکەی دەڵێ هەموو شەو پێکانی دەئاوسا لەبەر ڕاوەستان لەنوێژ ئەگەر هیزی لێبرابا دادەنیشت.

٧. ئەبو لعـالیە ڕەزای خـوای لێبێ : دەفەرموێ ئێمە ئەوەمـان پێ گەرەترین تاوان بوو کە مرۆڤ فیری قورئان بێ شـــەو تابەیانی بخەوێ و شەو نوێژ نەکا.

٨. حەسەنی بەسری ڕەزای خوای لێبێ هارێی ترس لە خواو خەم، دائیم دڵبەپەرۆش، پیاوی بێ خەو، لەیونسی کوری عوبەیدیان پرسی کەست دیوە کردەوەی حەسەنی بەسری هەبێ، وتی کەسم نەدیوە قسەی وەک قسەی ئەو وابێ چ جای بگا بەکردوە، دەوترێ لە ئوم سەلەمەی خیزانی پێغەمبەر شیری خواردوە بۆیە ئەوەندە بەهرەمەندو بەرەکەت داربوە، ئەگەر ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد چاوەکانی پر دەکرد لەگریان، کەس نەبو

بەقەدەر ئەو قسەی لەقسەی پێغەمبەران بچێ، ئەگەر لەترسی خوا گریابا وات دەزانی ئاگر تەنیا بۆ ئەو دروست بوە وابەتوندی دەگریا.

٩. رەبیعی کوری خوسەیم رەزای خوای لێبێ : قوتابی عبد اللهی کوری مەســـعود رەزای خوای لێبێ، عبدالله پێی دەفەرموو ئەی رەبیع ئەگەر پێغەمبەری خوا تۆی بینیبا زۆر دڵی پێـت خۆش دەبو علیه افضـــل الصــلوات وازکی التســليمات، هەموو لەبەر ئەوەبو عابدیکی راســتەقینە بو، عبد الرحمن کوري عـه جلان ده ڵێ شـــەوێ لای مامەوە تابەیانی بەگریانی توندەوە ئەو ئایەتەی خویندەوە: ﴿أَمۡ حَسِـــبَ ٱلَّذِينَ ٱجۡتَرَحُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجۡعَلَهُمۡ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحۡيَاهُمۡ وَمَمَاتُهُمۡۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾ (الجاثية: ٢١)،

واتە: ئایا ئەوانەی کە خراپەکانیان کردووە وا گومان دەبەن ئێمە ئەوانە وەکو کەســـانێ دادەنێن کە بڕوایان هێناوەو چاکەکانیان کردووە وەکو یەك بێت ژیانیان و مردنیان ئای چەند خراپ دادوەری دەکەن.

١٠. عوروەی کوری زوبەیری کوری عەوام، نەوەی ئەبوبەکر و نەوەی زوبەیر رەزای خوا لە هەمویـان بێ: ئەو پیـاوەی نـاسرابو بە ( المجتهـد المتعبـد الصـــوام) ئەو کەسی کە زۆر خۆی مـانـدو دەکردو بەنـدایەتی

دەکردو زۆر بەڕۆژو دەبو، عورووە عـادەتی وابوە ڕۆژانە یەک لەســەر چواری قورئانی موراجەعە دەکردەوە شــەوانە لە شــەو نوێژ ئەوانەی دوبارە دەکردەوە.

١١. موحەمەدی کوری ســیرین خەون زانی گەورەی ئومەت ڕەزای خوای لێبێ: هاورێکانی دەیان وت شــەو گویمان لە گریان و ناڵەی بو لەشەو نوێژدا، بەرۆژیش گویمان لە پێکەنینی بو.

١٢. مالکی کوری دینار ڕەزای خوای لێبێ: دەچۆ میحرابەکەی دەیوت ئەی پەروەردگارم خۆت دەزانی کێ ئەهلی بەهەشــتەو کێ ئەهلی ئاگرە، یارەب دەبێ مالک لە کامەیان بی ئەوجار دەستی دەکرد بەگریان.

١٣. ئەبو حەنیفەی ســەر مەزهەب ڕەزای خوای لێب: ئەبو عاصــم دەیوت ئەبو حەنیفە پێیدەوترا ســینگ، یان گوڵمیخ، چونکە لەشــەودا وەک سینگ دەچەقی لەنوێژدا، سوفیانی کوری عویەینە دەیوت لەسەر دەمی ئێمەدا کەس بەقەدەر ئەبو حەنیفە نوێژی نە دەکرد، بە تەواتور لێیان بینیوە کە شــەو تا بەیانی بەخەبەر بوەو گریاوە تا جیرانەکان و هاورێکانی بەزەییانپێدا هاتۆتەوە.

یارەب خوا لێتان ڕازی بێ هەڵگرانی دین و مەشخەڵانی ڕێگای خوا.

## خشوع و گەردن کەچی زانایان و خواناسان لە نوێژدا

بەدرێژای مێژوو پیاو چاکانی زۆر هەبون لەزانایان و نەخوێندەواران کە مێژوو شـــانازیان پێوە دەکا، وە لەئاســـمانی هیدایەتدا بونە چرایەکی پڕشنگدار کەئێمە لەبەر ڕۆشناییەکەی ڕێگا دەرئەکەین، بۆیە پێم خۆشە ســـاتێک لەخز مەتی خشـــوعی ئەم خوا ناســـانە دا کاتەکانمان بەســـەر بەرین، {لَقَدْ كَانَ فِي قَصَـــصِـــهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْـــدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِـــيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ }(يوسف: ١١١).

١. ئیمام مالک ی سەر مەزهەب ڕەزای خوای لێبێ: دەبێ ئەو ئیمامە حاڵی چۆن بوبێ لەخزمەتی خوا لەکاتی نوێژدا، کاتێک دەفەرموێ هەموو شەوێک بەخزمەتی ڕەسول الله دەگەم بەخەون علیه أفضل الصلوات وأزکی التسلیمات، ئیمامی مالک لەناو مەدینە سواری وەڵاخ نەدەبو دەیفەرمو بێ ئەدەبیە بەسواری وەڵاخ بەسەر خاکێک دا بڕۆم

خۆشەویستەکەمی تێدا نێژراوە، ئەگەر هەر کاتێک بیویستبا حەدیسی رەسول الله بخوێنێتەوە علیەأفضل الصلوات وأتم التسلیمات ، جلی جوان و خاوێنی لەبەر دەکرد، خۆی بۆن خۆش دەکرد، تەواو بەئەدەب دادەنیشت، جا ئەو جار فەرمودەی دەخوێندەوە.

٢. سـوفیانی سـەوری رەزای خوای لێیۆ: کاتێک کەشـەو دیۆ دڵخۆش دەبم کاتێک کەشـــەو دەروا دڵ تەنگ دەبم، رۆژێک ئێوارە نانی باشی خوارد دەیوت ئەگەر گا تێر بێ جوتی باش دەکا، ئەو شەوە تابەیانی بەپێوە بو شەو نوێژیکرد.

٣. بەشـیری کوری حارسی حافی رەزای خوای لێیۆ: پێیان گوت بۆ شـەو سـەعاتێک پشـوو نادەی؟ وتی پێغەمبەری خوا علیه الصـلاة والسـلام شـەو ئەوەندە شـەو نوێژی دەکرد پێ یەکانی دەئاوسـان، لەکاتێکدا خوای گەورە لەگونـاهەکانی خۆش ببوو، بەس من نـازانم داخوا خوای گەورە لەگوناهەکانم خۆش بوە یان نا، وە دەیفەرموو دەترسـم کاتێک مردن دەگاتە سەرم من خەوتبم.

٤. عبـدالرحمن ی کوری مەهـدی رەزای خوای لێیۆ: عەلی کوری مەدینی مـامۆسـتـای بوخـاری دەیفەرموو عبدالرحمن لەهەموو کەس

زاناترە بەفەرموودە، ئەم پیاوە بەدوو شـەو لە شـەو نوێژدا قورئانی خەتم دەکرد، واتە شەوی پازدە جوزئی دەخوێند.

٥. ئیمامی شافعی رەزای خوای لێبێ: رەبیعی کوری سولەیمان دەیفەرموو ئیمام شـەوی دەکرد بە سێ بەش، بەشـیک دەینوسی، بەشـێک شـەو نوێژی دەکرد، بەشـێک دەخەوت، ئیمام لەشـەو ڕۆژیکدا خەتمێکی دەکرد بەڵام ڕەمەزانان دوو خەتمی دەکرد، ئیمامی ئەحمەد دەیفەرموو شافعی وەک ڕۆژ وایە بۆ دونیا، وە وەک لەش ساغی وایە بۆ خەڵک، ئایا خەڵک دەتوانن لەم دوو شتە بێ ئیحتیاج بن؟

٦. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل رەزای خوای لێبێ: عبد الله کوری دەڵێ، باوکم لەسـەرەتای شـەو نوسـتنێکی سـوک دەخەوت لەپاشـان تا بەیانی دوعای دەکردو قورئانی دەخوێند، ئەبوبەکری میروەزی دەڵێ چوار مانگ لە غەزوە لەگەڵی دابوم بەهیچ شـیوەیەک نەمـدی واز لەقورئـان و شـەونوێژو قورئان خویندنی شـەو بێنێ، قازی ئەبو یەعلا دەڵێ، شـەوێک لە مەکە ئیمام ئەحمد هەموو قورئانی بۆ خویندین لەشەو نوێژ.

٧. ئیبن تەیمیە رەزای خوای لێبێ: ئیمامی موززی دەڵێ نەمدیوە وێنەی شـەیخ الاسـلام، وەخۆشی وێنەی خۆی نەدیوە، وەکەسـیش نەیدیوە، هەڵبەتە مەبەستی زەمانی خۆیەتی، ئیمام(ئیبن تەیمیە) شەوەکانی بەتەنیا

لەخزمەت پەروەردگاری بڕێدەکرد بەجۆرەها عیبادەت، بەســـەعات و چەند سەعات لەسەجدەدا دەمایەوە،

هەموو کتاب و قەڵەم و کەل و پەلی نوســـینیان لێســـتاندبوو لە زینـدانـدا، لەوکاتـانەدا بەتەواوەتی کەوتبوە ســـەر قورئانو، زیکرو، نوێژ کردن، زیاتر لەهەشــتا جار لە زینندا قورئانی خەتم کرد تا کۆتایی دەوتری لەخزمەت ئەو ئایەتە ڕوحی دەرچو کەدەفەرموێ: {إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ} (القمر: ٥٤). {فِي مَقْعَدِ صِـــدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ }(القمر: ٥٥)

واتە: لە نیشتگەیەکی پەسەندان لای پاشایەکی بە دەسەڵاتی توانا.

٨. مامۆســـتا ســـەید محمودی نۆڵچکەی ڕەحمەتی خوای لێبێ: من خۆم شـــاهیدم ئەوکات کە لە بۆســـکێن لە خزمەتی دابوم ئەلفیەی ئیبن مالکم هەندێک لەخزمەتی خوێند دوای ڕاپەڕین هەرکاتێک لەشـــەودا چوبای بۆ مزگەوت ئەو لەوێ بو بەدەگمەن وابو لەوێ نەبوبێ بەزۆری کە دەتبینی یان شـــەونوێژی دەکرد، یان شـــەو نوێژی تەواو کردبوو، دەســـبیحەکەی بەدەســـتەوە بو پاڵی بە پایەیەکی مزگەوت دەدا زیکری دەکرد، مامۆستا هەفتەی جارێک قوڕئانی خەتمدەکرد،

رەمەزانـان هەمو شـــەوو ڕۆژێ خەتمێکی دەکرد، ئەوکـات حـاجی ئەحمەدی پور زێنەب هەبوو رەحمەتی خوای لێ بێ نەمدەبینی کەشـــەو شەو نوێژ نەکا بەردەوام لەمزگەوت بو پێش بانگی بەیانی.

٩. ئەمســـاڵ لە موناســـەبەی ژن مارەکردن پیاوێکم بینی کوری ملا سـەعدی قەڵادزێ بوو ئەو مەلا سـەعدیە پیاویکی بەدین و بەکەرامەت و خاوەنی شـــەو نوێژی زۆر بوە خوای گەورە لێی رازی بێ کورەکە ی کە ناوی ســـەلامە، وتی پیاوێک هاوڕێی بابم بو واتە هەوڕێی ملا ســـەعدی بو، شـەوێک بگرە چەند شـەوێک چاوەدێری ئەو هاوڕێیەی بابم دەکرد شـێســت رەکات شـــەو نوێژی دەکرد، منیش پێم ســـەیر بو وتم بۆ ئەو هەموو شـــەو نوێژە دەکەی؟! وتی پێت زۆرە ! وتی دەنا باوکـت واتە ملاسەعدی شەوانە حەفتاو پێنج رەکاتی دەکرد.

١٠. ئەوکات مەقەڕمان لەخدراوە بو ماڵەکەی مامۆســـتا علی باپیر لەنزیک مزگەوتەکە بو ، زۆر بەوردی موتابەعەم دەکرد خوا شـــاهیدە مامۆســـتا کەبەیانیان دەهات بۆ مزگەوت زۆر جار هەســـتم دەکرد فرمیسـکەکانی دەسری و شـوێنەواری گریانی پێوە دیار بو، من زۆر سـودم لەو پیاوە بینیوە لەژیانم دا لەهەموو رویەکەوە، خوای گەورە سەربەرزی دین و دونیای کا، من تا مردن قەرزاری ئەوپیاوەم...

ئەگەر پێ یەکانیشـــمان کورت بێنێ لەوەی کە پێ یان بگەین، با زمانمان کورت نەهێنێ لەوەی زیکری خێریان بکەین.

## شەو نوێژ فێرگەو ژوانگەی دڵ بێداران

پێگەی شەو نوێژ لەقورئان و سونەت دا:

ئەم بەشـــە تایبەت دەکەم بە "شـــەو نوێژ"، چونکە شـــەو نوێژ پایەیەکی گرنگی هەیە لەقورئان ســـونەت دا وەکاریگەری زۆری هەیە لەپەروەدەکردنی مرۆڤی ئیمانداردا، هەموو شتێک لە شەریعەت دا بەپێی گرنگیەکەی پانتایی لە کتاب و سونەتدا داگیرکردوە، با سەرەتا تەماشای قورئان بکەین بزانین چۆن باسی "شەو نوێژی" کردوە.

١. { يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ} (المزمل: ١)

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیووە.

{قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا } (المزمل: ٢)

واتە: شەو هەستە (شەو نوێژ بکە) مەگەر کەمێکی نەبێت.

{نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا} (المزمل: ٣)

واتە:  نیوەی یا کەمێ لە نیوەی کەم بکەرەوە.

{أَوۡ زِدۡ عَلَيۡهِ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا } (المزمل: ٤)

واتە: یا کەمێ لێ ی زیاد بکە وە دەوری قورئان بکەرەوە بە لەسەر خۆیی واتە بە ڕێك و پێکی،

{إِنَّا سَنُلۡقِي عَلَيۡكَ قَوۡلًا ثَقِيلًا} (المزمل: ٥)

واتە:  بێگومانم ئێمە لەمەولا بۆت دەنێرینە خوارەوە گوفتاری (قورئان) ی قورس و گران.

{إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيۡلِ هِيَ أَشَدُّ وَطۡـًٔا وَأَقۡوَمُ قِيلًا} (المزمل: ٦)

واتە: بەڕاستی هەستانی شەو دوای خەو (بۆ خوا پەرستی) قورسترەو گرانترە لە ڕووی کردارەوە (لە هی ڕۆژ بەهێزترە بۆ دڵ) دروسترە لە ڕووی وتنەوە.

{ إِنَّ لَكَ فِي ٱلنَّهَارِ سَبۡحًا طَوِيلًا} (المزمل: ٧)

واتە:  بەڕاستی تۆ لە ڕۆژدا لە هاتوو چۆکردنێکی زۆردایت و توشی گرفتی زۆر دەبی پیویستت بە توێشوی شەوە.

هەر بۆیە مسوڵمانەکان لەخزمەتی پێغەمبەردا بەم هێزە روحیە، بەم بەندایەتیە ناوازە ڕوبەڕوی ئەو هەموو ســـەختی و ئازارو گاڵتە پێکران و سزادان و برســـیکرانە دەبونەوە، **من وا نازانم لە مێژوی مســـوڵماناندا زانایان و پیاو چاکان هەبوبن و دەوری کارایان لە ئوممەتدا بوبێ خاوەنی شەو نوێژ نەبوبن، با کەمیش بوبێ.**

٢. {وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا }(الفرقان:٦٤)،

واتە: وە کەسانێکن لە شەودا بۆ پەروەردگاریان سوژدە بەرن و شەو نوێژ دەکەن. واتە شەو لەخزمەتی پەروەردگاریان بەسەر دەبەن دەمێک بە پێوە، دەمێک بەکڕنۆش، بەراســـتی وەســـفێکی گەورەیە بۆ (عباد الرحمن).

٣. لەشەودا کەم دەخەون و لە پێش بەیانی کاتی سەحەر داوای لێبوردن لەخوا دەکەم {كَانُواْ قَلِيلٗا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ} (الذاريات: ١٧) واتە:

ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن واتە شەو نوێژیان دەکرد.

{وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ} (الذاريات: ١٨)

واتە: وە لە بەرەبەیاناندا داوای لێ خۆشبوونیان دەکرد. خۆیان بەخاوەنی ماڵی خۆیان نازانن لەبەرامبەر پەروەردگاریان.

{وَفِيٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ حَقّٞ لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ} (الذاريات: ١٩)

واتە: وە ماڵ و دارایی یاندا بۆ (هەژاری) داواکەرو داوانەکەر مافی خۆیان هەبوو.

٤. شـــەو لەتامەزرۆی موناجات لەگەڵ پەروەردگاریان کەلەکەکانیان لەسـەر جێگا ئۆقرە ناگرێ: { تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ يَدۡعُونَ رَبَّهُمۡ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ} (السجدة: ١٦)

واتە: تەنشـــتیان دوور ئەکەوێتەوە لە جێگای خەوتنیان (لەخەو هەڵدەسن شەو نوێژ دەکەن) هاوارو نزا لە پەروەردگاریان دەکەن بەترس و هیواوە و لەو ڕۆزی و سامانەی پێمان داون دەبەخشن.

٥. ڕۆژێک دێ بەم شـــەو بێداریەیان چاویان ڕون دەبێ بە شـــێوەیەک کەبەخەیاڵیاندا نەهاتوە: {فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعۡيُنٖ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ } (السجدة: ١٧)

واتە: ئینجا هیچ کەس نازانێ چی شاراوەتەوە بۆیان لە (بەهەشت دا کە هۆی) گەشبوونی چاوانن ئەم پاداشتە (دەدرێنەوە)، بەهۆی ئەو کردەوانەوەی کە کردویانە.

٦. بێدارانی شەو ئەهلی عیلم ن بە خوای خۆیان و بەمافی پەروەردگاریان:

{ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ}(الزمر: ٩)

واتە: هاوبەش دانەران چاکترن یا کەسێ ملکەچ و پەرست کارە (بۆ خوا) لە کاتەکانی شەودا بە سوجدە بردن و ڕاوەستان (لە شەو نوێژدا) کە لە (سزای) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی (ئەی موحەممەد(صلی الله علیه وسلم)) بلێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیری ئامۆژگاری وەردەگرن.

قیرائەتێکمان هەیە کە هەمزەکە بە (نیدا )بانگردن دەخوێنێتەوەو میمەکە بە توندی ناخوێنێتەوەی، واتە ئەی ئەو کەسانەی کە شەوا بێدارن و مل کەچن و سەجدە دەبەن و بەپێوە وەستاون، لە دوا ڕۆژ

دەترســێن و ئومێدتان بەرەحمەتی خوایە، چ خۆشــە بڕوادار لەو کاتەدا بێدار بێ کە پەروەردگاری بانگی دەکات.

٧. کەسێک بەتەمای پێگەی گەورە بێ دەبێ ئەهلی شەونوێژو هەستانەوە بێ، {وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا}(الإسراء: ٧٩)

واتە: وە (ئەی موحەممەد(صــلى الله عليه وســلم)) لەبەشــێکی شەودا هەستە شەو نوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە ئومێدەوار بە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەند کراو.

٨. {وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَٱسْجُدْ لَهُۥ وَسَبِّحْهُ لَيْلًا طَوِيلًا} (الإنسان: ٢٦)

واتە: وە لە شەوا سوژدەی بۆ بەرە (نوێژ بکە) وە ستایشی خوا بکە لە بەشێکی زۆر لە شەودا.

٩. {وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ}(الطور: ٤٩)

واتە: وە بیپەرستە و ستایشی بکە لە بەشێك لە شەودا وە کاتێ ئەستێرەکان ون دەبن پشت هەڵ دەکەن. لەشەوا تەسبیحات کردن لە هەرشتێک ز یاتر شەو نوێژ دەگرێتەوە.

١٠. {ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ} (آل عمران: ١٧)

واتە: ئەوانە بریتین لە ئارام گران و ڕاســـتگۆیان و فەرمانبەران و دارایی بەخت کەران و ئەوانەی کە داوای لێ خۆشــبوون دەکەن لە پێش بەیانیان دا.

ئەو کەســـانەی کەپەروەردگار لەئایەتەکانی پێشـــودا بریاری ڕازیبون بەهەشــتی پێدابون، ئەوانە ســیفەتیانە: {ٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ} (آل عمران: ١٧)

واتە: ئەوانە بریتین لە ئارام گران و ڕاســـتگۆیان و فەرمانبەران و دارایی بەخت کەران و ئەوانەی کە داوای لێ خۆشــبوون دەکەن لە پێش بەیانیان دا.

١١. ﴿لَيْسُــواْ سَــوَآءً مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ أُمَّةٌ قَآئِمَةٌ يَتْلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴾(آل عمران: ١١٣)

واتە: هـەموو(نـامـە دارەکـان) چوون یـەک نین لـەنـاو خـاوەن نامەکاندا دەســتەیەک ڕاســت و ڕێک هەن ئایەتەکانی خوا دەخوێنن لە (کاتەکانی) شەودا وە لە(کاتەکانی) کڕنوش بردنیاندا.

ئەوانەی جیاوازن و خوای گەورە لێیان ڕازیە ئەوانەن لەشــــەودا ئایەتەکانی دەخوێن وکڕنۆش بۆ خوا دەبەن.

١٢. شــەو نوێژ زۆر گەورەیە لەبەر ئەوەی ئەو هەموو بەڵگەی قورئانی لەسەرە کە باسمان کرد بێجگە لە بەڵگەکانی تری قورئان و سونەت.

١٣. شەو نوێژ پیشەی ساڵحانە : {نْ أَبِي أُمَامَةَ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَــلَّمَ أَنَّهُ قَالَ : " عَلَيْكُمْ بِقِيَامِ اللَّيْلِ ؛ فَإِنَّهُ دَأَبُ الصَّــالِحِينَ قَبْلَكُمْ، وَهُوَ قُرْبَةٌ إِلَى رَبِّكُمْ، وَمَكْفَرَةٌ لِلسَّــيِّئَاتِ، وَمَنْهَاةٌ لِلْإِثْمِ ". وَهَذَا أَصَــحُّ مِنْ حَدِيثِ أَبِي إِدْرِيسَ عَنْ بِلَالٍ.حكم الحديث: ( حديث بلال ) ضعيف، ( حديث أبي أمامة ) حسن صحيح رواه الترمذی.

١٤. پێغەمبەری خوا هەتا پێ کانی ئاوساون شەو نوێژی کردوە: ، {عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَانَ يَقُومُ مِنَ اللَّيْلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ قَدَمَاهُ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ : لِمَ تَصْنَعُ هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ وَقَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ. قَالَ : " أَفَلَا أُحِبُّ أَنْ أَكُونَ عَبْدًا شَكُورًا ". فَلَمَّا كَثُرَ لَحْمُهُ صَلَّى جَالِسًا، فَإِذَا أَرَادَ أَنْ يَرْكَعَ قَامَ فَقَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ}. رواه البخاری.

١٥. شەونوێژ باشترین هۆکاری چونە بەهەشتە: {عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ : " أَفْشُوا السَّلَامَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَاضْرِبُوا الْهَامَ، تُورَثُوا الْجِنَانَ "}. رواه الترمذی.

١٦. ئەوەی شەو نوێژ دەکا میرات گری کۆشکەکانی بەهەشتە: {النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " إِنَّ فِي الْجَنَّةِ غُرَفًا تُرَى ظُهُورُهَا مِنْ بُطُونِهَا، وَبُطُونُهَا مِنْ ظُهُورِهَا، فَقَامَ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ : لِمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ؟ قَالَ : لِمَنْ أَطَابَ الْكَلَامَ، وَأَطْعَمَ الطَّعَامَ، وَأَدَامَ الصِّيَامَ، وَصَلَّى لِلَّهِ بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ "}.رواه الترمذی.

١٧. ئەوەی پارێزەری لە شـــەو نوێژ بکا دەبێتە (محســـن ) چاکە کار،{ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُحۡسِـــنِينَ} (الذاريات: ١٦)،

واتە: ئەوەی خوا پێی داوون وەری دەگرن (چونکە) بێگومان ئەوان لەوەوپێش چاکە کاربوون.

١٨. خوای گەورە شایەتی ئیمانی تەواوی بۆ داون : { إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُـــجَّدًا وَسَـــبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ}(السجدة: ١٥)

واتە: تەنها کەســـانێ باوەڕ بە ئایەتەکانی ئێمە دێنن هەر کاتێ بەو(ئایەتانە) ئامۆژگاری بکرێن ئەکەون بە ڕوودا بە سوژدە بردنەوە و بە پاکی ستایشی پەروەردگاریان دەکەن و خۆیان بە گەورە دانانێن.

١٩. گەورەترین نوێژ لە دوای نوێژە فەرزەکان شـەونوێژە: {يَقُولُ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " أَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ قِيَامُ اللَّيْلِ، وَأَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ الْمُحَرَّمُ}". رواه النسائی.

٢٠. شـەو نوێژ شـەرەفی ئیمانداره، ئەوەی شـەو نوێژ دەکات شـایەنی ئێرەیی پێبردنە: {سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّهِ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـلَّمَ يَقُولُ : " لَا حَسَـــدَ إِلَّا عَلَى اثْنَتَيْنِ ؛ رَجُلٍ آتَاهُ اللَّهُ الْكِتَابَ، وَقَامَ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ، وَرَجُلٍ أَعْطَاهُ اللَّهُ مَالًا فَهُوَ يَتَصَدَّقُ بِهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ "}.رواه البخارى.

٢١. هەرکەسێک دە ئایەت لەشەونوێژا بخوێنێ لەئەهلی بێئاگا حساب ناکرێ: {رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَنْ قَامَ بِعَشْرِ آيَاتٍ لَمْ يُكْتَبْ مِنَ الْغَافِلِينَ، وَمَنْ قَامَ بِمِائَةِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْقَانِتِينَ، وَمَنْ قَامَ بِأَلْفِ آيَةٍ كُتِبَ مِنَ الْمُقَنْطِرِينَ ". حكم الحديث: صحيح رواه أبوداود.

٢٢. لەنیوەی دوەمی شـەو بەندە لەهەرکات لە خوا نزیکترە: {سَـمِعْتُ أَبَا أُمَامَةَ يَقُولُ : حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عَبَسَـةَ أَنَّهُ سَـمِعَ النَّبِيَّ صَـلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَـــلَّمَ يَقُولُ : " أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الرَّبُّ مِنَ الْعَبْدِ فِي جَوْفِ اللَّيْلِ الْآخِرِ ؛ فَإِنِ اسْـــتَطَعْتَ أَنْ تَكُونَ مِمَّنْ يَذْكُرُ اللَّهَ فِي تِلْكَ السَّـــاعَةِ فَكُنْ رواه الترمذي ". هَذَا حَدِيثٌ حَسَـــنٌ صَـــحِيحٌ غَرِيبٌ مِنْ هَذَا الْوَجْهِ.حكم الحديث: صحيح.

## ئادابەکانی شەو نوێژ

بۆ ئەوەی بەهرەمەند بین لە شەو نوێژو بەردەوام بین دەبێ ئەم ئادابانە ڕەچاو بکەین:

١. لەســـەرەتا کە دەخەوین نیەتی شـــەو نوێژمان هەبێ چونکە( إنما الاعمال بالنيات).

٢. زیکرەکانی کاتی خەو بخوێنین.

٣. ئەگەر هەستاین خەو لەچاومان بسرین، واتە دەست بەچاو مان دابێنین پێش چاو شوردن، وەک لەصحیح ی مسلم دا هاتوە پێغەمبەی خوا وای کردوە علیه الصلاة والسلام.

٤. زیکری لەخەو هەستان.

٥. دەست بەئاوگەیاندن دەست نوێژێکی پاك.

٦. کۆتای سورەتی آل عمران بخوێنین.

٧. دەست پێکردن بە دوو ڕکاتی کورت.

٨. ئەگەر بکرێ لەماڵەوە بێ چونکە ئەسڵ وایە سونەت لەماڵەوە بێ: وەک بوخاری و موسلم دەگێرنەوە لەپێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام.

٩. بەردەوام بون لەسەر شەو نوێژ با کەمیش بێ، چونکە چاکترین کردوە بەردەوامیە با کەمیش بێ وەک سەورەرمان دەفەرموێ.

١٠. ئەگەر زۆر خەوی هات با بخەوێ دواتر هەستێتەوە.

٢٢. هەستانەوەی ماڵ و مناڵ هەتا بکرێ.

٢. پێغەمبەری خوای فەرموی( قومی فأوتری یاعائشة) وەک لەبوخاری و موسلیم دا هاتوە.

١٣. هەتا بکرێ قورئان زۆر بخوێنێ و بەتێڕامانەوە.

١٤. ئەوەندە شەو نوێژ بکا تا دڵی بەئاگایە.

١٥. ئەگەر بیخاتە دوای خەوتن و هەستان لەخەو باشترە واتە بیکاتە تهجد.

١٦. دوعا لە سەجدە و رکوع.

١٧. جار جار شەو نوێژ بە جەماعەت بکرێ سودی زۆری هەیە هەم فێرکردنە، هەم هاندانە.

١٨. نوێژی وەتر لە بیر نەکەین ئەگەر بیخەینە کۆتایی شـــەو باشـــترە دەنا ئاساییە پێش خەوتن بکرێ یان دوای نوێژی خەوتنان.

## هۆکارەنی ئاسان بونی شەونوێژ

١. بزانین کە شەو نوێژ خێرو پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە.

٢. بزانین شـــەیتان لە کەمیندایە با فێلمان لێنە کا، پێمان دەڵێ جارێ بخەوە، جا خۆ واجب نیە، یان جارێ زویە، یان بۆ شەوێکی تر .

٣. بیر کردنەوە لە مردن و دوا ڕۆژ.

٤. قۆستنەوەی لەش ساغی و دەرفەت .

٥. زوو خەوتن مەگەر پێویست بێ.

٦. کەم خواردن و خواردنەوە.

٧. زیاد لە پێویست خۆماندو نەکەی بەڕۆژ.

٨. قەیلولەی پێش نیوەڕۆ.

٩. زیکرو دوعاو قورئان خوێندنی ڕۆژ، زۆر هاوکارن.

١٠. ئادابەکانی خەوتن ڕەچاو بکرێ.

١١. خۆپاراستن لەگوناهو تاوان باشترین هۆکاری شەو نوێژە.

١٢. بەکار هێنانی جەرەس یان جەرەسی مۆبایل بۆ هەستان لەخەو.

١٣. گرنگی دان بەنوێژی تەراویح خۆڕاهێنانێکی باشە بۆ فێر بونی شەو نوێژ.

١٤. ئەگەر سەرەتا قورس بێ بەڵام دواتر ئاسان دەبێ شەرت بەردەوام بونە.

١٥. بیر کردنەوە لە ژیانی پیاو چاکان و خوێندنەوەی زۆر کاریگەرە.

١٦. هاوڕێ یەتی پیاو چاکان و ئەوانەی ئەهلی شەونوێژن.

١٧. بەرۆژو بون کاریگەری زۆری هەیە بۆ هەستانەوە.

١٨. سەفەری حەج و عەمرە مەعنەویاتی مسوڵمان تەواو بەرز دەکەنەوە.

١٩. گرنگی دان بە کتابەکانی تەزکیەو خۆ پەروەردکردن بە رەوشتە بەرزەکان و پەرستشەکان.

٢٠. زیکرو قورئان خوێندن نابێ لەیاد بکەین.

٢١. خیرو سـەدەقە بەردەوامان دەکاو بەهرەمەندمان دەکا لەشـەو نوێژ.

٢٢. زوو خوێندنەوەی ئەو ئایەتانەی باسی گەورەی شـەو نوێژ دەکەن، هەروەها فەر مودە کان.

٢٣. دوعا بکەین بۆ ئەوەی شەو نوێژت بە نسیب بێ.

## سودەکانی شەو نوێژو هەستانەوە

١. یەکەم سود ئەوەیە کە ئیمە فەرمانی خوا جێ بەجێ دەکەین.

٢. سونەتی پێغەمبەران زیندو دەکەینەوە.

٣. شەو نوێژ مونەوەرو دڵخۆشمان دەکا.

٤. بەئەهلی زیکر هەژمار دەکرێین.

٥. هەڵوەرانی تاوان.

٦. زیاد بونی ئیمان هاندان بۆ کردەوەی چاك زیاترو زیاتر.

٧. لەزەت وەرگرتن لەقورئان و بەندایەتی.

٨. دوربوون لە ڕیایی.

٩. دوری لە نیفاق.

١٠. لەش ساغی و تەندروستی.

١١. وەگەرکەوتنی هۆرمۆنی گەشە کردن و دڵخۆش بوب.

١٢. وەڵام درانەوەی نزاو پاڕانەوە.

١٣. مرۆڤ لەڕۆژدا چالاک و ئازاو دڵخۆش دەبێ.

١٤. چونە ناو ڕیزی کاروانی گەورەی شەو نوێژ خوێنان.

١٥. هۆکاری رزق و رۆزی و دەرو لێکرانەوەیە،(نجيناهم بسحر).

١٦. درانەوەی قەرز.

١٧. شەو نوێژ ماڵ نورانی دەکا.

١٨. تەبایی بۆ خێزان دروست دەکات.

١٩. ژن و پیاو لای یەکتر خۆشەویست دەکا.

٢٠. فریشتەکانی رەحمەت هەمیشە لەگەڵمان دەبێ.

٢١. شەو نوێژ فێری زانست و زانیاریمان دەکا.

٢٢. ڕق هەستانی شەیتان.

٢٣. کردارەکان قەبوڵ و وەرگیراو دەبن.

٢٤. بەرەکەت کەوتنە ناو ژیان.

٢٥. مرۆڤ دەکاتە خاوەنی شەرم و شکۆو هەیبەت.

# {پێرست}

## سەرچاوەکان لەدوای قورئانی پیرۆز


- صحيح البخارى.
- صحيح مسلم
- سنن النسائي.
- سنن أبوداود.
- سنن الترمذي.
- سنن إبن ماجه.
- سنن الدارمي.
- موطأ إمام مالك.
- مسند إمام أحمد.
- الصلاة وحكم تاركها. لإبن القيم الجوزية.
- حكم تارك الصلاة. للألباني.
- رهبان الليل. دكتور سيد بن حسين العفاني.
- قيام الليل. سعيد بن علي بن وهف القحطاني.

- الخشـوع فى الصـلاةً في ضـوء الكتاب والسـنة. سـعيد بن علي بن وهف القحطاني.
- حكم تارك الصلاة. لإبن عثيمين.
- پوختەی تەفسیری قورئان. محمد ملا صالح بامۆکی.